بەسەرهاتەکانی

# ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا

نووسەر: لوویس کارۆڵ
وەرگێڕ: محەمەدئەمین شاسەنەم



بەسەرهاتەکانی

# ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا


نووسەر: لوویس کارۆل

وەرگێڕ: محەمەدئەمین شاسەنەم






چارلز لۆتویج داجسۆن (لوویس کارۆل)

(٢٧ی ژانویەی ١٨٣٢ ــ١٤ ژانویەی ١٨٩٨)

بەسەرهاتەکانی

# ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا

لوویس کارۆل

محەمەدئەمین شاسەنەم



بڵاوکەرەوەی کولەپشتی

سرشناسه : کارول، لوئیس، ۱۸۳۲–۱۸۹۸م.
Carroll, Lewis
عنوان قراردادی : ماجراهای آلیس در سرزمین عجایب. کردی
عنوان و نام پدیدآور : بەسەرهاتەکانی ئالیس لە ولاتی سەیروسەمەرەکاندا/ لوویس کارول؛ محەمەدئەمین شاسەنەم.
مشخصات نشر : تهران: کولەپشتی، ۱۳۹۱.
مشخصات ظاهری : ۱٦۰ص.: مصور.
شابک : ٦۰۰۰۰ریال :٥-٩٤-٥٨١٦-٦٠٠-٩٧٨
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : عنوان اصلی: .Alice's adventures in wonderland
یادداشت : اثر از متن فارسی تحت عنوان"ماجراهای آلیس در سرزمین عجایب" به کردی برگردان شده است.
موضوع : داستان‌های کودکان انگلیسی -- قرن ۱۹م.
شناسه افزوده : شاصنم، محمدامین، ۱۳۵۲ –، مترجم
رده بندی کنگره : PZV/۱۳۹۱ ۷۰۴۷ک۲۳آ
رده بندی دیویی : ۸۲۳/۸[ج]
شماره کتابشناسی ملی : ۲۹۰۳۳۷۱

بەسەرهاتەکانی ئالیس لە ولاتی سەیروسەمەرەکاندا

نووسەر: لوویس کارۆل
وەرگێڕ (فارسی): زوویا پیرزاد
وەرگێڕ (کوردی): محەمەدئەمین شاسەنەم
ڕوویەرگ: کاوە شێخی
بڵاوکەرەوە: کولەپشتی ـ تاران
شابەک: ۵-۹۴-۵۸۱۶-۶۰۰-۹۷۸
نۆرەی چاپ: یەکەم، ۲۷۱۲ی کوردی
تەژمار: ۱۰۰۰ دانە
نرخ: ۶۰۰۰ تمەن

ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە بە

پەریا و

هەموو مندالە چاوگەشەکانی کورد

## ناوەڕۆک

# پێشەکیی وەرگێڕی کوردی

چارلز داجسۆن لە ٢٧ی ژانویەی ساڵی ١٨٣٢ی زایینی لە دایک بوو. هەتا تەمەنی حەوت ساڵان لە وارینگتۆن ژیاوە کە باوکی لەوێ قەشە بوو. دوایە بنەماڵەکەیان چوون بۆ یۆرک شایەر. چارلز سێ برا و حەوت خوشکی هەبوو کە خۆی کوڕی گەورە و منداڵی سێهەمی بنەماڵەکەیان بوو.

لە مێرمنداڵیدا بە تەواوی زمانی دەگیرا و بۆ هەمیشەش بە جوانی چارەسەر نەبوو. دەڵێن لە سەرەتاوە زۆری پێوە نارەحەت بوو، بەڵام دواتر کە گەورە بوو و بوو بە لاوێکی بالابەرز و جوانچاک، ئیدی زمانگیرانەکەی نەبووە لەمپەری و لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بەشداری دەکرد.

سەرەتای خوێندنی، لە ماڵەوە و بە مامۆستای تایبەتی دەستپێکرد و لە قوتابخانەی شەوانەڕۆژی ڕیچمۆند وراگێبی و لە کۆتاییدا لە زانکۆی کلێسەی مەسیحی ئاکسفۆرد درێژەی بە خوێندن دا. لە کلێسە، لە بەر شارەزایی لە ماتماتیکدا، پێشنیاری وانەکوتنەوەی پێ کرا و بە داهاتێکی باشەوە دەستی بە کار کرد و هەتا کاتی مردنی، هەر لەوێ ماوە.

داجسۆن بەر لەوەی نووسینی کتێبە ناودارەکانی دەستپێبکا، زۆری وتار لە گۆڤاری جۆراوجۆردا نووسیبوو، هەر لەو کاتەدا کە چیرۆکە خۆشەکان و شێعرەکانی بە نێوی خوازراوەوە چاپ دەکران، بە نێوی ڕاستەقینەی خۆی، سەبارەت بە ماتماتیکیش کتێبی دەنووسی.

داجسۆن لە ساڵی ۱۸۶۲ی زایینی، کتێبی «بەسەرهاتەکانی ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا»ی بۆ ئالیس لیدل نووسی، کە کیژۆڵەیەکی دە ساڵانە و کچی "دەین هێنری لیدل"ی هاوڕێی خۆی بوو. پاش ماوەیەک کتێبەکەی لە سەرڕا نووسییەوە و هێندێک وێنەی بۆ کێشاوە و بۆ جۆرج مەکدۆنالدی خوێندەوە کە ئەویش چیرۆکی بۆ منداڵان دەنووسی. جۆرج و منداڵەکانی، کتێبەکەیان زۆر پێ خۆش بوو و داوایان لە کارۆل کرد چاپی بکا. هەر بۆیە لە ساڵی ۱۸۶۵دا، بنکەی مەکمیلان، ئەم کتێبەی چاپ کرد و جان تێنیل وێنەی باشتری بۆ کێشاوە و زۆر زوو، بوو بە یەکێک لە پڕفرۆشترین کتێبەکان.

کارۆل لە ۱۴ ژانویەی ساڵی ۱۸۹۸ی زایینی، بە نەخۆشی پەرکەم (ئانفلۆئانزا) کوچی دوایی کرد.

ئەو وەرگێڕانە کوردییەی لە بەردەستی ئێوەی خوێنەردایە، لە ڕووی وەرگێڕانی خانمی زوویا پیرزاد کراوە کە یەکێک لە باشترین وەرگێردراوەکانی ئەم کتێبەیە. وێنەکانی ئەم کتێبە، هونەرمەند پیتێر نێویل لە ساڵی ۱۹۰۱ی زایینیدا کێشاویەتەوە، کە لە وەرگێڕانەکەی پیرزاددا هێندێکیان لابرابوون.

لە کۆتاییدا پڕ بە دڵ سپاسی ئەم هاوڕێ بەڕێزانە دەکەم:

۱. کاک **ئەمین گەردیگلانی** کە زۆربەی شێعرەکانی جارێکی دیکە بۆ وەرگێڕام.

۲. **کاک عەزیز مەحموودپوور**

۳. **کاک عەلی جەوشەنی**

کە هەردووکیان سەرلەبەری کتێبەکەیان خوێندەوە و هەڵەوپەڵەیان بۆ ڕاست کردمەوە. نموونەیان هەر زۆر بێت. بەو هیوایەی بکەوێتە بەر دڵی خوێنەری کوردیش و منداڵە چاوگەشەکانی ئێمەش لە دنیای خۆشی ئالیس بێبەش نەبن.

محەمەئەمین شاسەنەم

بۆکان ـ ۲۷۱۲/۶/۸ی کوردی

E-mail: sha.sanam@yahoo.com

# پێشەکیی وەرگێڕی فارسی

لە پاشنیوەڕۆیەکی هاوینی ساڵی ١٨٦٢ی زایینی، چارلز لۆتویج داجسۆن، مامۆستای ماتماتیک لە زانستگای ئاکسفۆرد، کە دنیا بە ناوی لووئیس کارۆل دەیناسێ، چووە دیوەکەی خۆی، کڵاوە حەسیرییەکەی لە سەر داگرت و شەڵواری سپی و کۆتی درێژی کە لەو کاتەدا جلوبەرگی باوی کاتی سەیران لە سەردەمی ڤیکتۆریادا بوو، داکەند و جلی ماڵەوەی لەبەر کرد. دوایە لە پشت مێزی نووسینەکەی دانیشت و لە نێو دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا کە بە وردبینی و سەرنجەوە ڕایدەگرت، نووسی: «ئەم پاشنیوەڕۆیە لەگەڵ ڕابینسۆن داکوۆرت و خوشکانی لیدل سواری گەمی بووین.»

ئەو ڕووداوەی لە یاداشتەکانی ئەو ڕۆژەدا ئاماژەی پێنەکرا، ئەوە بوو کە ئالیس لیدل، کچی سەرۆکی لووئیس کارۆل لە زانستگا، لە کاتی بەلەمسواریدا وتی «ئاغای داجسۆن، تکایە هەقایەتمان بۆ بگێڕەوە.» لووئیس کارۆلیش کە خوداوڕاستان زمانی دەگیرا، بە گورجی هەقایەتێکی بۆ ساز کردن کە ناوی پاڵەوانەکەی ئالیس بوو. دوای تەواو بوونی سەیران و لە کاتی دابەزین لە گەمیەکە، ئالیس سەری بیچکۆلەی هەڵێنا و چەپکەقژێکی کە لە پەستا بەرچاوی دەگرت، لادا و وتی: «ئاغای داجسۆن، بریا بەسەرهاتەکانی ئالیست بۆ بنووسیبایەتمەوە!»

ئەم ڕووداوە ساکارە لەو ئێوارە زێڕینەی سەدەی نۆزدەهەمدا حەتمەن لە بیر دەچۆوە، ئەگەر لووئیس کارۆلی سی ساڵان و باڵابەرز و شەرمێون، کە زۆریش هۆگر بوو بە منداڵان، هۆندنەوەی شێعری بە ڕواڵەت بێواتا، کایە بە وشە و سەرقاڵییە ماتماتکییەکان، بڕیاری نەدابایە ئاواتی هاواڵی چکۆلەی خۆی، ئالیس لیدل، بێنێتە دی.

چەند ڕۆژ دوای ئەم عەسرە زێڕینە، کارۆل بە ڕابینسۆن داکوۆرتی هاوکار و هەڤاڵی خۆی وت: «بە درێژایی شەو نەخەوتووم هەتا ئەم قسە پڕوپووچانەی لە کاتی بەلەمسواریدا بۆ ئالیسم سازاندبوو، بنووسمەوە.»

قسەی پڕوپووچ؟؟!! ئەو هەقایەتەی بۆ ئالیس نووسرا، دوای چاپکران سەرنجی زۆر کەسی ڕاکێشا، چ لە نێو منداڵاندا و چ لە نێو گەورەکاندا. ناسراوترینی ئەم «گەورانە»، مەلەکە ڤیکتۆریا بوو کە دەڵێن دوای خوێندنەوەی "بەسەرهاتەکانی ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا" داوای کتێبەکانی دیکەی نووسەری کرد، بەڵام کتێبەکانی دیکەی نووسەر کە هەتا ئەوکاتە نووسیبووی، بریتی بوو لە هێندێک نووسراوە سەبارەت بە جەبر و ژمێرە و ماتماتیک!

ئالیس ئەگەرچی زمانێکی ساکاری هەبوو، بەڵام لە بەر کایە کردن بە وشە و تەنز و توانج و مەسەلی تایبەتی ئینگلیزی، بۆ وەرگێڕان کتێبێکی ساکار نەبوو. کەچی وردە وردە وەرگێڕدرایە سەر زیاتر لە پەنجا زمان و پێشوازییەکی باشی لێ کرا؛ تەنانەت هاتە نێو ڕادیۆ و فیلم و شانۆوە. سەبارەت بە "بەسەرهاتەکانی ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا" و لووئیس کارۆل و تەنانەت خودی ئالیس لیدل، زۆر کتێب نووسرا، لە سەرانسەری دنیادا زۆر بنکە دروست بوون و ئێستاش هەن کە سەبارەت بە بەسەرهاتەکانی ئالیس، ڕووداوەکان و کەسایەتییەکان، مانگنامە، وەرزنامە و ساڵنامە بڵاو دەکەنەوە و ڕستەکانی کتێبەکە شی دەکەنەوە، بەڵام نووسەر خۆی، لە یاداشتێکی ڕۆژانەدا، تەنیا ئەم ڕوونکردنەوەیە دەنووسێ:

«پاڵەوانی هەقایەتەکەم یەکڕاست ناردە کونی کەروێشکەوە، بەبێ ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە کە دوایە چ ڕووداوێکی بۆ دێتە پێش.»

نووسەر پاش چەند ساڵ، لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بە کتێبەکە دەنووسێ:

«ساڵانێکی زۆر بە سەر پاشنیوەڕۆ زێڕینەی کە ڕۆژی لەدایکبوونی تۆ بوو، تێپەڕیوە، بەڵام ساتەکانی لەدایکبوونتم هێندە بە جوانی لە بیرە کە دەڵێی هەر دوێنێکە بوو:

ئاسمانی شینی سامان، ئاوی ئاوێنەئاسای چۆم، گەمی کە بەبێ مەبەست دەڕۆیشت، ڕژانی دڵۆپی ئاو لە سەوڵەکانەوە و سێ ڕوخساری بچووک و تامەزرۆی "بەسەرهاتەکانی ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا"؛ هەموویان دەستیان لە دەستی یەک نا، هەتا ئەتۆ بێیتە سەر دنیا!»

ڕابینسۆن داکوۆرت شایەدی بۆ خولقانی لەپڕتاوی کتێبەکە دەدا:

«هەقایەتەکە ڕاست لە پاڵ مندا گوروا. داجسۆن و من سەوڵمان لێدەدا و ئالیس و دوو خوشکەکەی گوێقولاغ و تامەزرۆی دنیای هەقایەت بوون.»

دنیاش وەکوو ئالیس و خوشکەکانی، گوێیان ڕاگرت و تامەزرۆی دنیای ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا بوون. دنیایەک کە نووسەرەکەی، ڕەنگە هەر بە ناوشیاریش، چەند ساڵ بەر لە خولقانەکەی، لە یاداشتەکانی ڕۆژانەیدا ڕچەیەکمان پێ نیشان دەدا:

«بیرێک: زۆر جاران کە خەون دەبینین، هیچ گومانێکمان لە ڕاستبوونیدا نییە. خەون، دنیای تایبەتی خۆی هەیە و زۆر جاران هەر بە ڕادەی دنیای بەخەبەری، ڕاستەقینەیە.»

دنیای ئالیس، دنیای خەونە و دنیای منداڵی، دنیای خەونی منداڵێک.

ڕەنگە ئەم وتەیەی ڤیرجینیا وۆلف، کورتترین و جوانترین پێناسە بێ بۆ دنیای ئالیس:

«لووئیس کارۆل کارێکی کرد کە هیچ کەس نەیتوانی بەرپێوەی ببات، گەڕاوە بۆ دنیای منداڵی و لە سەرڕاوە دروستی کردەوە. **بەسەرهاتەکانی ئالیس لە وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا**، تەنیا کتێبێکە کە لەودا هەموومان دەتوانین ببینەوە بە منداڵ.»

زوویا پیرزاد

دەڕوا، لەم عەسرە زێڕینەدا، وەک لانکە
گەمیەکەمان بە سەر شەپۆلدا، هێمن
دوو باسکی چکۆلانە، دوو باسکی ناشی
بە دوو سەوڵ؛ دەمانبەنە خەونی بێبن

ئێوە ئەی سێ زاڵمی پێداگر لە من!
دەتانەوێ لەم هەوا مەستیهێنەدا
هەقایەت بگێڕمەوە، منداڵانە بێ؛
هێز و گوڕێک بجووڵێنم لەشم، کوا؟

حوکمی یەکەمیان دەڵێ: «زوو دەس پێبکە»
دووهەمی تکا دەکا: «نەقڵ و نەزیلان»
دەپەڕێتە نێو نەقڵەکەم سێهەم کچ؛
بەڵێ هەروایە هەڵسوکەوتی مناڵان!

زاڵ دەبێ لێرە بێدەنگی، سێ تامەزرۆش
مەستی تەماشای پەپوولەی شۆخی "خەیاڵ"؛
چەندە تیژ تێپەڕ ئەبێ بە سەیرەکاندا!
چ زوو کەوتۆتە دڵی مەلانی تیژباڵ!

جرِوجانەوەر بوونەتە هاوزمانی،
ئێرە مەڵبەندی سەیروسەمەرەکانە!
«درێژەی بەسەرهات، گوڵەکان! بۆ سبەی»
هاواری هەرسێ: «سبەی خۆ هەر ئەلئانە!»

ئەمە ئالیس! ئەمەش بەسەرهاتەکانی
هەقایەت وردە وردە دێتە ئاکام
بە شادی دەڕۆن، سێ دەریاپێوی ئەمن
ئێوارێ بەرەو ماڵێ، هێمن و ئارام

تۆش بە دڵۆڤانی هەقایەت دانێ
لەو جێیە کە مەڵبەندە بۆ خەونی مناڵان
وەک ئەو چەپکەگوڵانەی ئێستا سیسن
کە لە دوورەوە هێناویانە هەڤاڵان

## بەشی یەکەم:
## بەرەو کونە کەرویشک

ئالیس لە دانیشتن لە پاڵ خوشکەکەیدا لە قەراغ ئاو و لە بەر بێکاری بە تەواوی وەڕەز ببوو. یەک دوو جار بە دزییەوە چاوی لەو کتێبە کرد کە خوشکەکەی خەریک بوو دەیخوێندەوە، بەڵام کتێبەکە نە وێنەی هەبوو، نە وتوویژ. ئالیس لە دڵی خۆیدا وتی: «کتێب ئەگەر وێنە و وتوویژی تێدا نەبێ، بە کاری چی دێ؟!»

خەریک بوو بیری دەکردەوە (تا ئەو جێیەی بڕستی بۆ بیرکردنەوە هەبوو، چونکە گەرمای ڕۆژ بە تەواوی گێژ و وڕی کردبوو) دروست کردنی چەپکە گوڵێکی مینا ئەوندەی بایخ هەیە کە ئەو لە جێگای خۆی هەستێ یان نا، کە لە پڕدا کەرویشکێکی سپی بە چاوی پەمەییەوە بە هەڵاتن بە لایدا تێپەڕی.

ئالیس کاتێک بیستی کەرویشکەکە لە گەڵ خۆی قسە دەکات «ئەی هاوار! وەدرەنگی کەوتم!» زۆری پێ سەیر نەبوو و سەرنجی بۆ لای ڕانەکێشرا. (دواتر کە بیری لەم بەسەرهاتە دەکردەوە، بە خۆی دەوت دەبوایە لەم بابەتە سەری سووڕ بمایە، بەڵام لەو کاتەدا دەتکوت هەموو شتێک ئاسایی بوو!) بەڵام کاتێک کەرویشک لە گیرفانی جلیسقەکەی، سەعاتێکی دەرهێنا، چاوێکی لێ کرد و بە پەلە ڕێگای خۆی گرتەوە بەر، ئالیس هەڵبەزییەوە. بە زەینیدا هات هەتا ئێستاکە نەیدیوە کەرویشک جلیسقە لە بەر بکات، سەرەڕای ئەوەش، لە گیرفانی جلیسقەکەی سەعاتێکیش دەربێنێ. بە سەرنجەوە، لەو دەشتەدا بە دوای کەورێشکدا هەڵات و ڕاست لە کاتێکدا گەیشتە سەری کە کەرویشکەکە خەریک بوو دەچووە کونێکی گەورەی ژێر پەرژینەکە.



کەروێشکەکە خەریک بوو دەچووە کونێکی گەورەی ژێر پەرژینەکە.

ئالیسیش خێرا بە دوای کەروێشکدا خۆی خستە نێو کونەکەوە و هەر بیریشی لەوە نەکردەوە کە دوایە چۆن بێتەوە دەرێ.

کونەکە وەکوو دالانێکی درێژ هەتا مەودایەکی زۆر، ڕێک و ڕاست دەڕۆیشت و دوایە لە ناکاو گەیشتە لێژێک، ئەونده لە ناکاو بوو کە ئالیس هێشتا دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخسابوو وەخۆ کەوێ و ڕاوەستێ، دیتی لە سەر لێواری چاڵێکە و خەریکە بەر دەبێتەوە.

یان چاڵەکە زۆر قووڵ بوو یان ئالیس زۆر بە هێواشی دەکەوتە خوارەوە، چونکە هەروا کە بەرەو خوارەوە دەڕۆیشت، بە تەواوی دەرفەتی ئەوەی هەبوو چاوێک بە دەوروبەریدا بگێڕێ و پرسیار لە خۆی بکا دوایە چی ڕوو دەدا؟ سەرەتا چاوی لە ژێر لاقی خۆی کرد هەتا بزانێ دەکەوێتە کوێ؟ بەڵام ژێر لاقی تاریکەسەلاتێک بوو چاو چاوی نەدەدیت. دوایە چاوی لە قەبرغەی چاڵەکە کرد کە پڕ بوو لە قەفەسەی کتێب و کابینێتی قاپ و قاچاخ، لێرە و لەوێ پلان و وێنە بە گوڵمێخەوە هەڵواسرابوون. کاتێک لە لای قەفەسەیەکەوە تێپەڕ دەبوو، دەستی برد و شووشەیەکی هەڵگرت کە لێی نووسرابوو مرەبای پرتەقاڵ، بەڵام لە نەهامەتیی ئەو، شووشەکە هیچی تێدا نەبوو. لە ترسی ئەوەی لەو خوارە سەری کەسێک نەشکێنێ، شووشەکەی فڕێ نەدا و بە هەزار حەول و دەول خستییە نێو کابینێتێکەوە کە لە کاتی کەوتنە خوارەوەدا لە پەنایەوە تێپەڕ دەبوو.

بە خۆی وت: «دەی، دوای ئەم بەربوونەوەیە، ئیدی کەوتنە خوارەوە لە سەر پلیکان، خۆ ترسی نییە! بنەماڵەکەم لەم بوێرییەی من سەریان سووڕ دەمێنێ! ئیدی لە سەربانیش بکەومە خوارەوە، مته‌قم لێ نایە! (کە ئەمە قسەیەکی کەم نییە.)

خوار و خوارتر و دیسانەکەش خوارتر! بۆچی ئەم کەوتنە خوارەوە تەواو نابێ! ئالیس بە دەنگی بەرز، دەستی کرد بە قسەکردن «بڵێی هەتا ئێستا چەند کیلۆمیتر چووبێتمە خوارەوە؟ دەبێ گەیشتبێتمە شوێنێکی نزیک ناوەندی زەوی! چی! واتە بەم پێیە دەبێ

شەش هەزار کیلۆمیتر بێ،» (ئـالیس لە پـۆلدا هێنـدێک شـتی لەم بـابەتە فێـر ببـوو و ئەگەرچی ئێستاکە کاتی ئەوە نەبوو زانیارییەکانی بە چاوی ئەم و ئەودا بـداتەوە، چـونکە ئەوێ کەسی لـێ نەبـوو کە گـوێی بـۆ ڕاگرێ، کەچـی پێـی نـاخۆش نەبـوو بە وانەکـانیدا بێتەوە.)، «ـ بەڵێ، کەمتاکورت شتێکی ئاوا. ـ بەڵام نازانم گەیشتوومەتە کـامە درێـژی و پانـایی جوغرافیـایی؟» (ئـالیس هەر نەشـیدەزانی درێـژی جوغرافیـایی یـان پانـایی جوغرافیایی یانی چی، بەڵام بیری کردەوە ئەمانە وشەی تەقورەق و قەڵەمین.)

دیسان دەستی پـێ کـردەوە. «ڕەنـگە لە نێوەڕاستی زەوییـەوە تێپەڕ بم و لەو لایەی دیکەیەوە دەرچم! چەندە پێکەنینییە! دەگەمە نێو خەڵکانێک کە بە سەر دەڕۆن! پێموابێ پێیـان دەڵـێن سـەرلاقەکان. (ئەم جارەیـان زۆری پـێ خـۆش بـوو کە کەس لەوێ نەبـوو و قسـەکانی ئەمـی نەبیسـت، چـونکە خۆشـی پێـی وا بـوو کەڵکـی لە وشـەیەکی دروسـت وەرنەگرتووە.» «بەڵام ئاخری ناچارم لە کەسێک بپرسم نـاوی ئەو ولاتەی لێـی دێـمە دەرێ چییە، «ببووره دادە، ئێرە ئوسترالیایە یان نیوو زیلاند؟» (حەولی دا لە کـاتی پرسـیندا بە ئەدەبەوە بنووشتێتەوە ـ بێننە بەرچاوتان! نووشتانەوە لە کاتی کەوتـنە خـوارەوەدا! ئێـوە پێتانوایە بتوانن لە کاتی بەربوونەوەدا بنووشـتێتەوە؟) «حەتـمەن ئەم خـانمەش لە دڵـی خۆیدا دەڵێ هەی لەو کـچە بێهۆشوگۆشـە! نـا، پرسـیار کـردن بـێکەڵکە! ڕەنـگە نـاوی ولاتەکەیان لە شوێنێکدا نووسیبێ.»

خوار و خوارتر و لەوەش خوارتر! ئالیس کە ئیدی کاری دیکەی نەبوو، دیسـان دەسـتی کردەوە بە قسە کردن «پـێموایە ئەمشـەو داینـا زۆرم بیـر دەکـا (داینـا پشـیلەکەی بـوو.) «بەشکم لە بیریان بێ بۆ عەسرۆژە قاپە شیرەکەی پڕ بکەن. داینـا، خۆشەویسـتەکەم! بریـا تـۆش لێـرە بـوایەی، لەم خـوارە، لەگەڵ مـن! بە داخەوەم، لێـرە، لەم حەوایە مشـک گیـر ناکەوێ. بەڵام ڕەنگە بتوانی شەمشەمەکوێرەیەک ڕاو بکەی. دەزانی شەمشـەمەکوێرە لە مشک دەچێ؟ ئەرێ بەڕاست پشیلە شەمشەمەکوێرە دەخوا؟» کە گەیشتە ئێـرە، چـونکە

خەوی دەهـات، بە دەنگێکـی خەواڵـووەوە ئەم ڕستـەیەی دووپـات دەکـردەوە «پشـیلە شەمشـەمەکوێرە دەخـوا؟ پشـیلە شەمشـەمەکوێرە دەخـوا؟» جـاری واش بـوو دەیکـوت «شەمشەمەکوێرە پشیلە دەخـوا؟» چـونکە وەڵامـی هیچکامیـانی نەدەزانـی، جیـاوازیی نەبوو کامەیان بپرسێ. هەستی کرد خەونووچکە بردوویەتەوە و خەریک بوو خەوی دەدیت کە ئەوە دەستی لە نێو دەستی دایینادایە و خەریکی پیاسـە کـردنن و بە گەرموگـوڕی لێـی دەپرسێ «دایینا! ڕاستم پێ بڵـێ! قەت شەمشـەمەکوێرەت خـواردووە؟» کە لە پـڕدا، تلـپ! کەوت بە سەر کۆمایەک گەڵای ویشکدا و بەربوونەوە کۆتایی هات.

ئالیس کە هەر بە حاستەمیش هێشی پێ نەگەیشـتبوو، خێـرا قـوت بـۆوە و ڕاوەسـتا. چاوێکی لە سـەرێ کـرد، بەڵام سـەرێ تاریکەسـەلاتێک بـوو نەبێـتەوە. لە بەرامـبەریدا داڵانێکی درێژی دیکە هەبوو کە کەروێشکە سپییەکە بە هەڵەداوان لەوێوە دەڕۆیشت. بـۆ ئەوە نەدەبوو کات بە فیڕۆ بدا! وەکوو بای شەماڵ وەڕێکەوت و ڕاست کاتێـک گەیشت کە کەروێشـک خەریـک بـوو لە پێچـێکەوە تێـدەپەڕی و بە خـۆی دەوت «ئەی هـاوار! گوێچکەکانم! سمێڵم! چەندە درەنگە!» ئـالیس ڕێـک لە دوای کەروێشـکەکەوە بـوو، بەڵام کاتێک لە پێچەکەوە تێپەڕی، ئەوی نەدی. ئێستاکە ئەو لە نێو تالارێکی درێـژدا بـوو کە تاقێکی قـوڵەی هەبـوو و ڕیزێـک چـرا کە بە بنمـیچەوە هەڵواسـرابوون، وڵاتـی ڕوونـاک دەکردەوە.

دەوراندەوری تالارەکە پڕ بوو لە درگـا بەڵام هەموویـان قفڵیـان پێـوە بـوو. ئـالیس بە دەوری تالاردا هات و دانە بە دانە دەرگاکانی تاقی کردەوە، دوایە بە ناڕەحەتییەوە گەڕاوە نێوەڕاستی تالار، ئەوندە بیری لە ڕێگای دەرچوون کردبۆوە، گێژ ببوو.

لە پڕدا مێزێکی چکۆلەی سێ پایەی دیت، هەمووی شووشە. سەر مێزەکە هیچـی لـێ نەبوو، کلیلێکی زێڕینی چکۆلە نەبێ. یەکەم شت کە بە زەینـی گەیشـت ئەوە بـوو ڕەنـگە ئەم کلیلە زێڕە هی یەکێک لەم درگایانە بێ، بەڵام زۆر بە داخەوە! یان کونی قفڵەکـان زۆر

خەوی دەهات، بە دەنگێکی خەواڵووەوە ئەم ڕستەیەی دووپات دەکردەوە «پشیلە شەمشەمەکوێرە دەخوا؟ پشیلە شەمشەمەکوێرە دەخوا؟» جاری واش بوو دەیکوت «شەمشەمەکوێرە پشیلە دەخوا؟» چونکە وەڵامی هیچکامیانی نەدەزانی، جیاوازیی نەبوو کامەیان بپرسێ. هەستی کرد خەونووچکە بردوویەتەوە و خەریک بوو خەوی دەدیت کە ئەوە دەستی لە نێو دەستی دایناداپە و خەریکی پیاسە کردنن و بە گەرموگوڕی لێی دەپرسێ «دایناا ڕاستم پێ بڵێ! قەت شەمشەمەکوێرەت خواردووە؟» کە لە پڕدا، تلّپا کەوت بە سەر کۆمایەک گەڵای ویشکدا و بەربوونەوە کۆتایی هات.

ئالیس کە هەر بە حاستەمیش هێشی پێ نەگەیشتبوو، خێرا قوت بۆوە و ڕاوەستا. چاوێکی لە سەرێ کرد، بەڵام سەرێ تاریکەسەلاتێک بوو نەبێتەوە. لە بەرامبەری‌دا داڵانێکی درێژی دیکە هەبوو کە کەروێشکە سپییەکە بە هەڵەداوان لەوێوە دەڕۆیشت. بۆ ئەوە نەدەبوو کات بە فیڕۆ بدا! وەکوو بای شەماڵ وەڕێکەوت و ڕاست کاتێک گەیشت کە کەروێشک خەریک بوو لە پێچێکەوە تێدەپەڕی و بە خۆی دەوت «ئەی هاوار! گوێچکەکانم! سمێڵم! چەندە درەنگە!» ئالیس ڕێک لە دوای کەروێشکەکەوە بوو، بەڵام کاتێک لە پێچەکەوە تێپەڕی، ئەوی نەدی. ئێستاکە ئەو لە نێو تالارێکی درێژدا بوو کە تاقێکی قوڵەی هەبوو و ڕیزێک چرا کە بە بن‌میچەوە هەڵواسرابوون، وڵاتی ڕووناک دەکردەوە.

دەوراندەوری تالارەکە پڕ بوو لە درگا بەڵام هەموویان قفڵیان پێوە بوو. ئالیس بە دەوری تالاردا هات و دانە بە دانە دەرگاکانی تاقی کردەوە، دوایە بە ناڕەحەتییەوە گەڕاوە نێوەڕاستی تالار، ئەوندە بیری لە ڕێگای دەرچوون کردبۆوە، گێژ ببوو.

لە پڕدا مێزێکی چکۆلەی سێ پایەی دیت، هەمووی شووشە. سەر مێزەکە هیچی لێ نەبوو، کلیلێکی زێڕینی چکۆلە نەبێ. یەکەم شت کە بە زەینی گەیشت ئەوە بوو ڕەنگە ئەم کلیلە زێڕە هی یەکێک لەم درگایانە بێ، بەڵام زۆر بە داخەوە! یان کونی قفڵەکان زۆر

گەورە بوون یان کلیلەکە زۆر چکۆلە، چونکە کلیلە زێڕەکە هیچ درگایەکی پێ نەکراوە. بۆ جاری دووهەم کە خەریک بوو بە دەوری تالارەکەدا دەسووڕاوە، پەردەیەکی قوڵەی دیت کە پێشتر سەرنجی پێ نەدابوو. لە پشت پەردەکەوە درگایەکی چکۆلە هەبوو بە بەرزایی نزیکەی چل سانتیمیتر. ئالیس کلیلە زێڕەکەی خستە نێو قفڵی درگا چکۆلەکەوە؛ کە دیتی کلیلەکە بۆ قفڵەکە دەبێ، لە خۆشیانا شاگەشکە بوو.

درگاکە بەرەو ڕێڕەوێکی چکۆلە دەکراوە بە قەد کونەمشکێک. چۆکی دادا و لەم لایەی ڕێڕەوەکەوە چاوی بە باغێکی هێندە جوان کەوت کە بە عومراتی خۆتان قەت شتی واتان نەدیوە.

چەندەی پێ خۆش بوو لە تالاری نیوەتاریک بڕواتە دەرێ و لە نێو ئەو هەموو باغچە پڕ لە گوڵ و فیشقاوە فێنکانەدا سەیران بکا، بەڵام تەنانەت سەریشی بەو درگایەدا نەدەچوو. ئەو بەستەزمانە بیری کردەوە «وای دانێم سەریشم تێوەی چوو، ئەی شانوقۆڵم چی؟ بریا وەک تەلەسکۆپ لە نێو یەک ڕۆچووبایەم و چکۆلە ببایەتمەوە. پێموابێ دەبێ! تەنیا ئەگەر بزانم لە کوێوە دەستپێبکەم.» لەم ئاخرانەدا ئەوندە ڕووداوی سەیروسەمەرە قەومابوو، خەریک بوو بێتە سەر ئەو بڕوایە کە دەکرێ زۆربەی شتەکان ڕووبدەن و بێنەدی.

وا دیار بوو ڕاوەستان لە پەنای درگا چکۆلەکە بێکەڵک بوو. ئالیس دیسان چووەوە لای مێزەکە. دەتکوت هیوادار بوو کلیلێکی دیکە ببینێتەوە یان لانیکەم دەفتەرچەیەک کە شێوەی قوڵەبوونەوەی بنیادەمەکان و وەکوو تەلەسکۆپ لێهاتنی تێدا نووسرابێ. ئەمجارەیان لە سەر مێزەکە بتڵێکی چکۆلەی دیت. (کە دڵنیا بوو پێشتر لەوێ نەبوو.) لەتە کاغەزێک بە بتڵەکەدا هەڵواسرابوو کە بە پیتی درشت و جوان لە سەری نووسرابوو:
**بمخۆوە!**

دروستە لێی نووسرابوو «بمخۆوە»، بەڵام ئالیسە چکۆلەی ژیر، بە تەما نەبوو پەلە بکات. «نا، دەبێ لە پێشدا جوان چاوی لێ بکەم بزانم نیشانەی "ژار"ی پێوە نەبێ.» چونکە ئالیس سەبارەت بەو منداڵانەی لەشیان سووتابوو یان ببوونە پێخۆری گیانلەبەری درندە، یان بەڵای دیکەیان بە سەر هاتبوو، زۆر چیرۆکی شیرین و سەرنجڕاکێشی خوێندبۆوە، هەموو ئەو بەسەرهاتانەش لە بەر ئەوە بوو کە ئەو منداڵانە، ئەو ڕێنوێنییە ساکارانەی هاوالەکانیان فێریان کردبوون، لە بیریان چووبۆوە. بۆ نموونە: ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر، مقاشێکی گەرم لە دەستتدا ڕاگری، دەستت دەسووتێ؛ یان ئەگەر زۆر بە شپرزەیی، قامکت بە چەقۆ ببڕی، خوێنی لێ دێ. بەڵام ئالیس بە جوانی لە بیری بوو کە ئەگەر لە بتڵێک کە نیشانەی "ژار"ی پێوەیە، زۆر بخواتەوە، درەنگ یان زوو حاڵی شڕ دەکا.

هەرچۆنێک بێ، ئەم بتڵە نیشانەی "ژار"ی پێوە نەبوو، هەر بۆیە ئالیس چشی لێ کرد و قومێکی خواردەوە و چونکە تامەکەی زۆر پێ خۆش بوو (تامی ساردەمەنییەکە تێکەڵاوێک بوو لە تامی کەیکی بەڵاڵووکی، فرنی، ئاناناس، قەلی سوورەوەکراو، نوقڵ و نانی گەرمی بە کەرە چەورکراو) زۆر زوو هەمووی هەڵقوڕاند.

★★★★★

لە دڵی خۆیدا وتی «چەندە سەیرە! خەریکە وەکوو تەلەسکۆپ کۆ دەبمەوە.»

هەرواش بوو! قەڵافەتی ببوو بە بیست و پێنج سانتیمیتر؛ لەم بیرە کە ئێستاکە دەتوانێ لەو درگا چکۆلەوە تێپەڕ بێ و بچێتە نێو باخەکەوە، ئاراوقارای لێ هەڵگیرا. بەڵام چەند دەقە هەر ڕاوەستا بزانێ لەوەش چکۆلەتر دەبێتەوە یان نا. لەم بارەوە کەمێک نیگەران بوو. «ڕەنگە وەکوو شەم بتوێمەوە و ئیدی لە نێو بچم. ئەوکات چۆنم لێ دێ؟» حەولی دا بێنێتە بەرچاوی خۆی کە گڕی شەم دوای سووتان و توانەوە چ قەڵافەتێکی دەبێ. قەتی شتی وا وەبیر نەدەهات.

دوای چەند دەقەیەک کە زانی شتێکی دیکە ڕوونادا، بڕیاری دا خێرا بچێتە نێو باخەکە، بەڵام سەد مخابن! کە گەیشتە لای درگا چکۆلەکە، وەبیری هاتەوە کلیلە زێڕەکەی هەڵنەگرتووە، بە دوای کلیلەکەدا گەڕاوە و دیتی دەستی پێی ناگا! لە بن شووشەکەوە کلیلەکەی بە جوانی دەدیت. زۆری حەول دا یەکێک لە پێچکەکان بگرێ و پێیدا سەرکەوێ. بەڵام پێچکەی مێزەکە لووس و خز بوو. ئەو بەستەزمانە کە هەموو ڕیسەکەی ببۆوە خوری و حەول و تەقەلالا، شەکەت و ماندووی کردبوو، لە سەر عەرزی دانیشت و زۆرە زۆر گریا.

«بیبڕەوە! ئەم فینگەفینگە بێکەڵکەت لە چییە!» خەریک بوو لەگەڵ خۆی بە شەڕ دەهات. «بە قسەم بکە و خێرا دەسهەڵگرە!» ئالیس زۆر جار ئامۆژگاریی چاکی بە خۆی دەکرد (ئەگەرچی زۆر کەم بە قسەی خۆی دەکرد) جارجارەش ئەوندە جیددی سەرکۆنەی خۆی دەکرد کە وەگریان دەکەوت. وەبیری هاتەوە کە جارێکیان ویستبووی شەقەزللەیەکی باش لە بناگوێی خۆی بدا، چونکە کاتێک کە خەریک بوو بە تەنیایی لەگەڵ خۆی کایەی کرۆکێتی[1] دەکرد، گزەی کردبوو. ئەم منداڵە سەیرە، زۆری پێ خۆش بوو هەمیشە وا نیشان بدات کە لە یەک کاتدا دوو کەسە. «بەڵام ئێستاکە چ کەڵکێکی هەیە خۆم بە دوو کەس بنوێنم. ئەو قەڵافەتەی لێم ماوەتەوە، بە یەک کەسی تەواو و بەکارهاتووش نابێ.»

---

[1] جۆرێک یارییە بە ئاڵقە و گۆ. Croquet




*لە سەر عەرزی دانیشت و زۆرە زۆر گریا*

هەر لەم کاتەدا چاوی کەوت بە قوتووە شووشەیەکی چکۆلە کە لە ژێر مێزەکەدا بوو. قوتــووەکەی کــردەوە، شــیرینییەکی زۆر چکــۆلەی دیــت کە بە دەنکــی کشــمیش بە شـێوەیەکی زۆر جـوان و ڕێکـوپێـک لە سـەری نووسـرابوو: بمخـۆ! ئـالیس وتـی: «باشـە، دەیخـۆم! ئەگەر گەورەتـر بـبمەوە، ئەوە دەسـتم بە کلـیلەکە دەگـا، ئەگەریـش چکـۆلەتر ببمەوە، ئەوە بە زگەخشکە دەڕۆم و لە ژێر درگاکەوە تێدەپەڕم. بە هەر دوو باردا، دەگەمە باخەکە و هەرچی دەبێ با بێ!»

گازێکی چکۆلەی لە شیرینییەکە گرت و بە دڵەڕاوکێوە وتی «چکـۆلەتر دەبـمەوە یـان گەورەتر؟ چکۆلەتر؟ گەورەتر؟» دەستی لە سەر سەری دانابوو بزانێ گەورەتر دەبێتەوە یان چکۆلەتر، چەندەی پێ سـەیر بـوو کە دیتـی هەر لە قەوارەی خـۆیدا مـاوەتەوە. هەڵـبەت ئەمە ڕووداوێکە کە لە کاتی شیرینی خواردندا بۆ هەرکەسێک دێتە پـێش، بەڵام ئـالیس ئەوندە خووی بە ڕووداوی سەیروسەمەرە گرتبوو، کە بە بڕوای ئەو، ژیانی ئاسایی، شتێکی گەوجانە و جاڕزکەر بوو.

دەستی پێکرد و زۆر زوو هەموو شیرینییەکانی هەڵمەقووت کرد.



## بەشی دووهەم:
## ئەستێری فرمێسک

ئـالیس قیژانـدی «سـەیرانەتر و سـەیرانەترا» (بـۆ سـاتێک وا پەشـۆکابوو کە شـێوەی دروستی قسە کردنیشـی لە بیـر چـۆوە.) ئێسـتاکە وەکـوو گەورەتـرین تەلەسـکۆپی دنیـا خەریکم لێک دەڕەوێمەوە. خوداتان لەگەڵ لاقەکان!» (چـونکە کاتێـک سـەری دانەوانـد و چاوی لە خوارێ کرد، لاقەکانی ئەوندە بە خێرایی لێک دوور دەکەوتـنەوە، زۆر بە ئاسـتەم دەیدیتن.) «لاقە چکۆلە بەستەزمانەکانم، ئێستاکە کێ کەوش و گۆرەویتان لە بەر دەکـا؟ دیارە کە من ئیتر ناتوانم! ئەوندەتان لێ دوورم کە دەبێ ئیتر هەر باسیشتان نەکەم! خۆتان لە بیری خۆتاندا بن.» دوایە لە دڵی خۆیدا وتی «بەڵام وا باشە لەگەڵ لاقەکـانم مێهرەبـان بم، دەنا ڕەنگە نەمبەن بۆ ئەو ڕێگایەی دەمهەوێ. ئەهها، زانیم! هەموو ساڵێک جووتێک چەکمەی نوێیان بە جێژنانە دەدەمێ.»

لە زەینی خۆیدا خەریکی گەڵاڵەدارشتنی کـارەکە بـوو. «دەبـێ بە ڕاسـپاردە بینێـرم. چەنـدە پێکەنینیـیە! کـابرا دیـاری بنێـرێ بـۆ لاقـی خـۆی. ئەوە هـیچ، ناونیشـانی سـەر قوتووەکان بۆ ناڵێی!



ئێستاکە وەکوو گەورەترین تەلەسکۆپی دنیا خەریکم لێک دەڕەوێمەوە.

**(بەڕێز لاقی ڕاستی ئالیس،**
**بەرامبەر بە کوورەی دیواری**
**لە پاڵ پرپیشکگرەکە؛**

**لەگەڵ جوانترین هیواکانم: ئالیس)**

خودایە! ئەم قسە قۆڕانە چییە دەیڵێم!»

هەر لەو کاتەدا سەری لە بنمیچی تالار کەوت. چونکە ئێستاکە باڵای لە دوو میتر تێپەڕیبوو. خێرا کلیلە چکۆلە زێڕەکەی هەڵگرت و بەرەو باخەکە هەڵات.

بەستەزمانە! تەنیا کارێک کە دەیتوانی بیکا ئەوە بوو بە لاشان لە سەر عەرز ڕاکشێ و بە چاوێک لەم لای ڕێڕەوەکەوە چاو لە باخ بکا. بەڵام ئێستاکە ڕۆیشتن بۆ ئەوبەری تالارەکە، ئیدی هەر بە خەونیش جێبەجێ نەدەبوو. لە سەر عەرز دانیشت و دەستی کردەوە بە گریان.

«شەرم بتگرێ! (دیسان لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد) کچێک بەم زەلامییە دەبێ ئاوا بگری؟ (قسەیەکی بێجێش نەبوو.) بیبڕەوە! لەگەڵ تۆمە!» بەڵام خۆی پێ ڕاگیر نەدەکرا و فرمێسک هەر هات و هەر هات هەتاکوو دەوروبەرەکەی بوو بە ئەستێرێک بە قووڵایی نزیکەی دە سانتیمیتر کە دەگەیشتە نێوەڕاستی تالارەکە.

پاش ماوەیەک لە دوورەوە تەپەتەپی لاقی بیست. بە پەلە فرمێسکەکانی سڕی هەتا بزانێ کێیە. کەروێشکی سپی بوو کە بە سەر و پۆتراکی ڕازاوەوە دەگەڕاوە. جووتێک دەسکێشی چەرمی لە دەستێکیدا و لە دەستەکەی دیکەیدا باوەشێنێکی گەورە. بە پەلە دەهات و لە ژێر لێوەوە دەیکوت «هاوار، خاتوون! چونکە لە چاوەڕوانیدا ڕامگرتووە، تۆخماخی سەرم دەکا!» ئالیس کە گەیشتبووە ئەوپەڕی ناهومێدی، ئامادە بوو داوای یارمەتی لە هەموو کەسێک بکا، هەرکە کەروێشک نزیک بۆوە، بە هێمنی و شەرمەوە وتی: «کاکە، ببوورە! دەکرێ...» کەروێشک شڵەژا و هەڵبەزییەوە، دەسکێش و باوەشێنەکەی فڕێ دا و بە قەڵەمبازێک لە نێو تاریکیدا ون بوو.



دەسکێش و باوەشێنەکەی فڕێ دا و بە قەڵەمبازێک لە نێو تاریکی‌دا ون بوو.

ئالیس دەسکێش و باوەشێنەکەی هەڵگرتەوە و چونکە هەوای نێو تالارەکە گەرم بوو، خۆی فێنک کردەوە و دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵ خۆی. «هەی‌هەی، ئەمڕۆکە هەموو شتێک زۆر سەیروسەمەرەیە! بەڵام خۆ هەتا دوێنێکە بارودۆخ هەر وەک جاران بوو. نەکا دوێنێ‌شەو لە خەودا گۆڕابێتم؟ دادەی! ئەمڕۆ کاتێک لە خەو هەستام، هیچ گۆڕابووم؟ ئێستێ کە جوان بیری لێ دەکەمەوە، پێموابێ بەیانی کەمێک گۆڕابووم. بەڵام ئەگەر من هەر ئەو کەسە نیم کە دوێنێ بووم، ئەی کێم؟ لێم بۆتە مەتەڵ!» خەریک بوو بیری لەو منداڵە ناسیاوانەی هاوتەمەنی خۆی دەکردەوە، دەیویست بزانێ بۆتە یەکێک لەوان.

«دڵنیام ئادا[1] نیم. چونکە قژی ئادا درێژ و لوولە، قژی من لوول نییە. دڵنیام "مەیبێل"[2]یش نیم، چونکە من شت زۆر دەزانم و مەیبێل ـ پەککوو! مەیبێل چەندە حەپۆلە! ئەوە هیچ، مەیبێل مەیبێلە و من منم ـ وەی خودایە گیان! ئەم شتە چەندە تێکەڵ‌پێکەڵە! با بزانم ئەو شتانەی دەمزانی، ئێستاش دەیزانم یان نا. باشە، چوار دانە پێنجی دەکاتە دوازدە، چوار شەشی دەکاتە سێزدە، چوار حەوتی دەکاتە ـ ئەی خودا! ئاوا قەت بە بیست ناگەم! بەڵام خۆ خشتەی زەرب نابێتە بەڵگە، با بچینە سەر جوغرافیا: لەندەن پێتەختی پاریسە، پاریس پێتەختی ڕۆمە، ڕۆم پێتەختی ـ هاوار! نا! دڵنیام هەمووی هەڵەیە! حەتمەن جێگاکەم لەگەڵ مەیبێل گۆڕاوە! ئێستا با حەول بدەم شێعری هەویری بە موو لە بەر بخوێنمەوە.» دەست لە سەر سنگ، هەر دەتکوت وانەکە دەڵێتەوە، دەستی پێ کرد. بەڵام دەنگی گیراو و ناناسایی دەنواند و شێعرەکە وەک خۆی، ڕێکوپێک دەرنەدەهات:

ڕێوییەکی جوان و جەحێڵ — وتی بە یەکی بەفێڵ
تاژییەک هەیە ناشنامە — وا بۆم نووسیوە نامە
بیبە و وەڵامی بێنە — سەد کەرم لێ بستێنە

---

[1] Ada
[2] Mabel

کـــاکی ڕێـــــوی پێکەنـــــی: بـــۆ ئەقڵـــم لـــێ ئەســـەنی؟!
هەویـــــرت بـــێ مـــوو نیـــیە زۆر درەنـــــگە، زوو نیـــــیە
کەری زۆر و کـــــــاری کەم مـــن خـــۆم دەبـــێ تێـــی بـــگەم
تـــۆ گۆشـــت کەر نـــادەی بە مـــن گۆشـــــتم دەدەی بە دوژمـــــن[1]

«دڵنیام بە دروستی نایخوێنمەوە!» بەستەزمانە دیسان چاوەکانی فرمێسکیان تێزا. «ئەگەر وایە حەتمەن بوومەتە مەیبێل. ئێستاکە ناچارم لەو ماڵە چکۆلە و تاریکەدا بژیم و کەرستەی کایە کردنیشم نەبێ ـ هەک قوڕ بە سەرم، دەبێ چەندە دەرس بخوێنم! نا، بڕیاری خۆم داوە! ئەگەر بڕیارە مەیبێل بم، هەر لەم خوارە دەمێنمەوە! پێویست ناکا کەسێک سەر بەم کونەدا بکا و بڵێ: بە قوربان، وەرەوە سەرێ! ئەگەر کەسێک هات، سەر هەڵدێنم و لێی دەپرسم: لە پێش‌دا بڵێ من کێم؟ ئەگەر کەسەکەم خۆش‌ویست، دەچمە سەرێ، دەنا ئەوندە لەم خوارە دەمێنمەوە تاکوو ببمە کەسێکی دیکە. بەڵام سەد خۆزگە ـ» قوڵپی گریان گرتی. «بریا کەسێک سەری بکردایە بەم کونەدا! لەم تەنیاییە زۆر زۆر وەڕەزم.»

کە ئەمەی وت، چاوی لە دەستەکانی کرد و بە واقوڕماوی دیتی کە لە کاتی قسە کردن‌دا تایەکی دەسکێشە چکۆلەکانی کەروێشکەکەی لە دەست کردووە. بیری کردەوە «شتی وا نابێ! ڕەنگە دیسان خەریکە چکۆلە ببمەوە.» هەستا چووە لای مێزەکە هەتا باڵای بە باڵای مێزەکە بگرێ. بە پێوانەی خۆی، ئێستاکە ببووە شەست سانتی‌میتر و هەر دەهات و بە خێرایی چکۆلە دەبۆوە. زۆر زوو زانی هۆیەکەی، ئەو باوەشێنەیە کە بە دەستیەوەیە و ڕێک لە کاتی خۆی‌دا، بەر لەوەی بە تەواوی لە نێو بچێ، باوەشێنەکەی حەوا دا.

[1] (بۆ کوردستان، سنە، هەژار، ل ٢٤١.)

«شوکور لەو مەترسییە ڕزگار بووم!» ئالیس لەم گۆڕانە لەناکاوە تەواو ترسابوو بەڵام سەرەڕای ئەوە، خۆشحاڵیش بوو کە دەیدی هێشتا هەر زیندووە. «دەی ئێستاکە! یاڵڵا بەرەو باخ!» گەڕاوە و بازی دا بۆ لای درگا چکۆلەکە. بەڵام بە داخەوە! درگاکە قفڵ کرابوو و کلیلە زێڕەکەش هێشتا لە سەر مێزە شووشەییەکە بوو. ئەو بەستەزمانە لە دڵی خۆیدا وتی «بارودۆخەکە لەوەش خراپتر بوو! چونکە هیچ کات ئەوندە چکۆلە نەببوومەوە، هیچ کات! دەبێ بڵێم ئەم بارودۆخەم پێ خۆش نییە. هەر ئەوەی کە وتم!»

هەرکە ئەوەی وت، لاقی خزی و شڵپ! هەتا چەناگەی لە ئاوێکی سوێر ڕۆچوو. یەکەمین شت کە بە زەینیدا هات ئەوە بوو کەوتۆتە نێو دەریاوە. «ئەگەر وا بێ، بە شەمەندەفەر دەگەڕێمەوە.» (ئالیس لە ماوەی تەمەنیدا تەنیا جارێک چووبووە کەنار دەریا و هەر بەم یەک جارەش گەیشتبووە ئەم ئاکامە گشتییە کە ئێوە لە ئینگلیس بۆ کەناری هەر دەریایەک بچن، لەوێ هێندێک ژووری جلداکەندن دەبینن، دوایە پۆلێک منداڵ کە بە کەوچکە دار خەریکی قووڵ کردنی زیخن، دوایە ڕیزێک ماڵی بەکرێ و لە پشت ماڵەکانیشەوە، وێستگەی شەمەندەفەر.) هەرچۆنێک بێ، ئالیس زۆر زوو زانی کەوتۆتە نێو ئەستێری ئەو فرمێسکانەی کە هەر بۆخۆی کاتێک دوو میتر باڵای بەرز بوو، وەراندبووی.

هەروا کە مەلەی دەکرد و بە دوای ڕێگایەکدا دەگەڕا لەم شوێنە بێتە دەرێ، وتی «بریا ئەوندە نەگریابام، ئێستاکە وا دیارە تەمبێ دەکرێم، ئەویش بە نوقم بوون لە فرمێسکی خۆمدا! ئەمە ئیدی بۆ بڕوا کردن نابێ! جا ئەمڕۆکە چ شتێک بۆ بڕوا کردن دەبێ؟!»

هەر لەم کاتەدا، بڕێک لەولاوەتر دەنگی شڵپەشڵپی لە نێو ئەستێرەکەدا بیست و بە مەلێ نزیک بۆوە بزانێ چ باسە. لە پێشدا ئەوەی بە زەیندا هات کە دەبێ شێرماسی یان ئەسپێکی ئاوی بێ، بەڵام دوایە بیری هاتەوە ئێستاکە خۆی چەندە چکۆلەیە، و زۆر زوو زانی ئەم دەنگ و هەرایە هی مشکێکە کە وەکوو خۆی کەوتۆتە نێو ئاو.

بیری کردەوە «نازانم قسە کردن لەگەڵ ئەم مشکە قازانجی هەیە یان نا؟ لەم خوارە شتەکان ئەوندە سەیروسەمەرەن کە ئەگەر ئەو مشکەش قسە بکات، سەرم سوورِ نامێنێ. هەرچۆنێک بێ، بۆ ئەوە دەبێ بەتاقی بکەمەوە.» دەستی پێ‌کرد «هۆی مشکەکە! تۆ دەزانی چۆن دەتوانین لەم ئەستێرە بچینە دەرێ؟ من لە مەلە ماندوو بووم. هۆی مشکەکە!» (پێی وا بوو شێوەی دروست قسە کردن لەگەڵ مشکێک هەر ئاوایە. تا ئێستا کاری وای نەکردبوو بەڵام لە بیری بوو کە لە کتێبی رێزمانی لاتینی براکەیدا خوێندبوویەوە: مشکێک ـ لە مشکێک ـ بە مشکێک ـ مشکێک ـ هۆی مشکەکە!» مشکە بە شکەوە چاوی لە ئالیس کرد و وا دیار بوو بە یەکێک لە چاوە چکۆلەکانی چاوێکیشی داگرت، بەڵام هیچی نەکوت.

ئالیس بیری کردەوە «رەنگە ئینگلیزی نەزانێ. ئەگەر بە هەڵە نەچووبێتم، ئەمە مشکێکی فەرەنسییە کە لەگەڵ ویلیامی سەرکەوتوودا[1] هاتۆتە وڵاتەکەمان.» (ئەگەرچی هێندێک شتی سەبارەت بە مێژوو دەزانی، بەڵام بە دروستی زەمانی رووداوە مێژووییەکانی نەدەزانی و نەیدەزانی چی کەی رووی داوە.) دەستی پێ‌کردەوە و ئەمجارەیان بە فەرەنسی وتی «پشیلەکەم لە کوێیە؟» کە ئەمە یەکەمین رستەی وانەی زمانی فەرەنسییەکەیان بوو. مشکە بە بازێک لە ئاوەکە دەرپەڕی، لە ترسانا وەک شەقشەقە دەلەرزی. ئالیس بە پەشۆکاوی قیژاندی «ئەی هاوار! ببوورە!» نیگەران بوو کە نەکا ئەو ئاژەڵە بێچارەیەی نارەحەت کردبێ. «لە بیرم نەبوو ئێوە پشیلەتان خۆش‌ناوێ.»

مشکە بە تووڕەییەوە زیقاندی «پشیلەم خۆش‌بوێ؟ ئەتۆ لە جێی من بوایەی، خۆشتدەویست؟»

---

[1] ویلیامی سەرکەوتوو (ویلیام فاتح) یان ویلیامی یەکەم کەلەساڵی ١٠٦٦ هەتا ١٠٨٧ پادشای ئینگلیس بوو.



*مشکە بە بازێک لە ئاوەکە دەرپەڕی، لە ترسانا وەک شەقشەقە دەلەرزی.*

ئالیس بە هێمنی وتی «دەی، ڕەنگە خۆشیشم نەویستایە. باشە تووڕە مەبە. ئەگەرچی زۆرم پێ خۆش بوو دایمنام پێ نیشان دابایەی. پێموایە ئەگەر بتدیبایە، ئیدی حەتمەن پشیلەت خۆشدەویست. ئەوندە نازدار و خرپنە ـ» ئالیس بە جوانی لە نێو ئەستێرەکەدا مەلەی دەکرد و هەروەک لەگەڵ خۆی قسە بکا، دەیکوت «ئەوندە جوان لە پەنای کوورەکە دەخەوێ، دەمیاوێنێ، دەست و دەموچاوی دەلێسێتەوە ـ ئەگەر دەستی بە سەردا دێنی، ئەوندە نەرمە... ئەوە هیچ! بلیمەتێکە لە ڕاو کردنی مشکدا!» دیسان قیژاندی «ئۆۆۆی! زۆر زۆر ببوورە!» چونکە ئەمجارەیان مشکەکە تەواوی قژی قرژ ببوونەوە و ئالیس دڵنیا بوو کە ئیدی بەڕاستی پێی ناخۆش بووە. «زۆر باشە، ئەگەر پێت خۆش نییە، هەر باسی داینا ناکەم.»

مشکە کە تەنانەت نووکی کلکیشی دەلەرزی، قیژاندی «قسە ناکەین؟ هەی لەو بەزمە! هەر دەڵێی من دەستم پێ کردووە! بنەماڵەی ئێمە هەموو کات ڕقیان لە پشیلە بووە! بوونەوەری گڵاوی پیسی بێنرخ! ناویان نەهێنی!»

ئالیس بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ، بە پەلە وتی «باشە، هەر باسیشیان ناکەین! بڵێ بزانم تۆ سە... سەگت خۆشدەوێ؟» کە مشکە وەڵامی نەداوە، بە هۆگرییەوە درێژەی بە قسەکانی دا «لە نزیک ماڵی ئێمە سەگێکی ژیکەڵەی چکۆڵەی لێیە، زۆرم پێخۆشە ببینی. چاوەکانی ڕوون، قژی بۆر و درێژ و لوول. هەرکە شتێک حەوا بدەی خێرا هەڵدێ و دەیهێنێتەوە. لە سەر دوو لاق دادەنیشێ هەتا خواردەمەنیت لێ وەرگرێ، زۆر کاری دیکەش دەزانێ کە من لە بیرم نییە. خاوەنەکەی کە مەزرای هەیە دەڵێ سەگەکەی زۆر بەکەڵکی دێ و زۆر بەنرخە، چونکە خورماپێچانەکان دەکوژێ... ئۆۆۆۆی خودایە گیان!» بە ناڕەحەتییەوە قیژاندی «پێموابێ دیسان گوڵم بە ئاودا دا!» چونکە مشکەکە بە مەلێ لە ئالیس دوور کەوتەوە و پەلەقاژەی ئەو، شەپۆلی خستە نێو ئەستێرەکە. ئالیس بە هێمنی هەرای کرد «مشکێ! بە قوربان! تکایە بگەڕێوە. ئێستێ کە سەگ و پشیلەت خۆش ناوێ، باشە، ئیدی ناویشیان ناهێنم!» مشکە کە ئەمەی بیست دەوری لێ داوە و بە ئارامی بە مەلێ کردن بەرەو لای ئالیس هات. ڕەنگ بە ڕوویەوە نەمابوو (ئالیس پێی وا بوو لە بەر شڵەژاویی زۆرە،) بە ئارامی و لێوەلەرە وتی «کاتێ چووینە دەرێ، بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە هەتا بزانی بۆچی ئەوندە رقم لە سەگ و پشیلەیە.»

هەر ڕاست کاتی ڕۆیشتنە دەرێش بوو. ئەستێرەکە خەریک بوو تەواو قەرەباڵغ دەبوو، چونکە باڵندە و گیانلەبەر نەمابوو نەکەوتبێتە نێوی: مراوی، دۆدۆ[1]، تووتیی ئوسترالیایی، بەچکە هەڵۆ و زۆر گیانلەبەری سەیری دیکە. ئالیس وەپێشیان کەوت و پۆلەکە بە مەلێ کردن گەیشتە لێوار.

---

[1] dodo، مەلێکە کەمێک لە قەل گەورەترە، هەڵنافڕێ و لە مێژە قڕی تێکەوتووە.

## بەشی سێهەم:
# پێشبڕکێی هەڵبژاردن و چیرۆکی درێژەدار

قەلافەتی ئەوانەی لە دەوری ئەستێرەکە کۆ ببوونەوە، بەڕاستی جێی سەرنج بوو - باڵندەکان بە پەڕوپۆی خووساوەوە، ئاژەڵەکان بە کوڵک و مووی بە لەشەوە نووساو، هەموویان خووساو و تووڕە و نارەحەت.

دیارە یەکەمین پرسیار ئەوە بوو کە چۆن خۆیان ویشک بکەنەوە. لەم بارەوە کەوتنە ڕاوێژ کردن لەگەڵ یەک و دوای چەند دەقە ئالیس زۆری پێ ئاسایی بوو کە دیتی بە سانایی و زۆر دۆستانە لەگەڵیان دەدوێ، هەر دەتکوت ماوەیەکی زۆرە دەیانناسێ. لە ڕاستیدا قرموقاڵێکی زۆریشی لەگەڵ تووتیی ئوسترالیایی کرد هەتا ئاخری تووتی بە جاڕزییەوە وتی «چونکە من لە تۆ گەورەترم، کەوایە ئەقڵیشم لە تۆ زیاترە.» ئالیس کە ڕازی نەببوو، ویستی بزانێ تەمەنی تووتی چەندەیە و چونکە تووتی بە هیچ جۆرێک وەلامی نەداوە و نەیویست تەمەنی بدرکێنێ، باسەکەیان بێ ئاکام ما.

ئاخری مشک کە بە ڕواڵەت قسەکەی لە نێویاندا بڕی هەبوو، بە دەنگی بەرز وتی: «دانیشن! دانیشن و گوێ بدەنێ! هەر بە چاوتروکانێک ویشکتان دەکەمەوە!» هەموویان خێرا بە دەوری مشکدا کۆزیلکەیان بەست؛ ئالیس بە دڵەڕاوکێوە چاوی لە مشک بڕی، چونکە دڵنیا بوو ئەگەر بە زوویی خۆی ویشک نەکاتەوە، هەلامەتێکی پیس دەگرێ.

«ئەهم!» مشک قوڕگی خاوێن کردەوە و بە دەبدەبەوە وتی «هەمووتان ئامادەن؟ بە عومرانتان لەوەی دەمهەوێ بیلێم، **ویشکتر**تان نەدیوە و نەبیستووە! بێدەنگ! تکایە

هەمووتـان بێـدەنگ! ویلیـامی سـەرکەوتوو کە پـاپی گەورە پشـتیوانی بـوو، بە قسـەی ئینگلیسییەکانی کرد کە پێویستیان بە ڕێبەر بوو و هەر لە کۆنەوە خوویان گرتبوو بە داگیر کردن و تالاَن و برۆ. ئێدوین[١] و مۆرکار[٢] نەجیمزادەکانی مێرسیا[٣] و نورتامبریا[٤] ...»

تووتی گزگزا. «ئەح ئەح!»

مشک بە ئەدەبەوە بەڵام قەڵسانە پرسیاری کرد «ببوورە، شتێکت وت؟»

تووتی بە پەشۆکاوی وەڵامی داوە «من؟ نا هیچم نەوت!»

مشک وتی «پێموابوو شتێکت وت. زۆر باشە، پاشماوەی قسەکانم: ئێدوین و مۆرکار نەجیمزادەکانی مێرسیا و نۆرتامبریا یەکیەتیی خۆیان لەگەڵ ئەو ڕاگەیاند و تەنانەت ستیگاند،[٥] ئۆسقۆفی گەورە و وڵاتپەروەری کانتێربێری[٦] تێگەیشت ـ»

مراوی وتی «**تێ** چی؟»

مشک بە تووڕەییەوە وەڵامی داوە «**گەیشت**! مانای گەیشتن نازانی؟»

مراوی وتی «مانای گەیشتم دەزانم! گەیشتن یانی هاتن بۆ جێگایەک. وەکوو زۆربەی ئەو کاتانەی من دەگەم بە شتێک کە زۆرتر یان کرمە یان بۆق. ئێستاکە بزانم ئۆسقۆفی مەزن بە چی گەیشت؟»

مشک خۆی لێ گێل کرد و بە پەلە درێژەی پێدا «تێگەیشت کە وا باشترە لەگەڵ ئێدگار ئەتێلینگ[٧] بچێ و ویلیام ببینێ و تاجی پادشایەتی پێشکەشی ئەو بکا. ویلیام سەرەتا شێوازی ناونجی گرتە بەر، بەڵام ڕووهەڵماڵدراویی نۆرمەنەکان... حاڵت چۆنە خۆشەویستم؟» لەگەڵ ئالیسی بوو.

---

[١] Edwin
[٢] Morcar
[٣] Mercia
[٤] Northumbria
[٥] Stigand
[٦] Canterbury
[٧] Edgar Atheling

ئالیس بە خەمۆکی وەڵامی داوە «هێشتا زۆر تەڕم. هەردەڵێی ویشک نابمەوە.»

دۆدۆ لە جێی خۆی هەستا و بە گرژی و جیددییەوە وتی «کەوایە، بەندە کۆتایی کۆبوونەوەکە ڕادەگەیەنم، بۆ گرتنی بڕیارێکی خێرا و پێویست، لەمەڕ وەدەسهێنانی چارەسەرییەکی لەزەبر...»

بەچکە هەڵۆ وتی «ناکرێ وەکوو بەشەر قسە بکەی؟ خۆ لە مانای نیوەی ئەم قسە قەڵەمییانەت نەگەیشتم! ئەوەش هیچ! پێموانییە تۆ خۆشت حاڵی بووبی.» سەری بەرداوە هەتا کەس پێکەنینەکەی نەبینێ. چەند باڵندەیەکیش بە دزییەوە پێکەنین.

دۆدۆ بە دڵڕەنجاوییەوە وتی «من تەنیا ویستم بڵێم باشترین ڕێگای ویشک بوونەوەی ئێمە، پێشبڕکێی هەڵبژرادنە.»

ئالیس پرسیی «پێشبڕکێی هەڵبژاردن چییە؟» زۆریش هۆگری زانینەکەی نەبو؛ بەڵام دۆدۆ دەتکوت چاوەڕێی ئەوەیە کەسێک شتێک بڵێ و وا دیار بوو کەسیش بە تەمای پرسیار نەبوو.

دۆدۆ وتی «باشترین ڕێگای شرۆڤە کردنەکەی، جێبەجێ کردنەکەیەتی.» (پێتان دەڵێم دۆدۆ چی کرد، چونکە ڕەنگە ڕۆژێکی ساردی زستانی، ئێوەش بتانهەوێ ئەم پێشبڕکێیە بکەن.)

سەرەتا شوێنی پێشبڕکێکەی بە شێوەی جەغزێک دیاری کرد. (وتی «شکڵی دروست، زۆر گرینگ نییە.») دوایە هەموو کەسەکانی دەستەکە لەو شوێنە وێستان. «یەک، دوو، سێ، دەس پێبکەن!»ێک لە ئارادا نەبوو. هەرکەسێک هەر کاتێک پێی خۆش بوایە، هەڵدەهات و هەر کاتێکیش پێی خۆش بوایە ڕادەوەستا، هەر بۆیە زۆر ئاستەم بوو بزانی کەنگێ پێشبڕکێ تەواو بووە. کاتێک هەموویان نیو سەعات هەڵاتن و کەمتاکورتێ ویشک بوونەوە، لە پڕدا دۆدۆ ڕایگەیاند «پێشبڕکێ تەواو بوو!» هەموویان بە دەوری دۆدۆدا کۆ بوونەوە و بە هەناسەبڕکێ پرسیاریان کرد «دەی کێ بردیەوە؟»



پێشبڕکێی هەڵبژاردن

بۆ وەڵام دانەوە بەم پرسیارە، دەبوو دۆدۆ بە تەواوی مێشکی وەکار بخستبایە. بۆ قەدەرێکی باش قامکی بە نێوچاوانیەوە نا (وەکوو ئەو شێوەیەی کە زۆرتر لە وێنەکانی شکسپێردا دەیبینین.) ئەوانی دیکەش کڕوکپ چاوەڕێ بوون. ئاخری دۆدۆ وتی «هەمووتان بردتانەوە و هەموو دەبێ خەڵات بکرێن.»

چەند دەنگ پێکەوە پرسییان «بەڵام کێ خەڵاتەکە دەدا؟»

دۆدۆ وتی «دەی دیارە! ئەو!» بە قامکی ئاماژەی بە ئالیس کرد. دەستەکە خێرا بە دەوری ئالیسدا کۆزیلکەیان بەست و هەموویان پێکەوە و تێکەڵوپێکەڵ هاواریان کرد «خەڵات! خەڵات!»

ئالیس کە ئەقڵی بە شتێک نەدەگەیشت، بە ناهومێدی دەستی کرد بە گیرفانیدا و بەستەیەکی نوقڵ دەرهێنا (بە خۆشییەوە ئاوی سوێر نەچووبووە نێو بەستەکەوە) و بە ناوی خەڵات پێیاندا هات. هەر کەسەی دروست نوقڵێکی وەبەر کەوت.

مشک وتی «ئەی بۆخۆی؟ بۆخۆشی دەبێ خەڵات وەرگرێ.»

دۆدۆ زۆر جیددی وتی «حەتمەنە.» بەرەو ئالیس وەرسووڕا. «چی دیکەت لە گیرفاندا هەیە؟»

ئالیس بە ناڕەحەتییەوە وتی «تەنیا ئەنگوستیلەیەک.»

دۆدۆ وتی «بیدە بە من.»

دیسان بە دەوری ئالیسدا کۆزیلکەیان بەست و دۆدۆ بە ڕێزی تەواوەوە ئەنگوستیلەکەی پێشکەشی ئالیس کرد و وتی «تکامان وایە ئەم ئەنگوستیلە نەخشینە لە ئێمە وەربگری.» پاش ئەم قسە کورتە هەموویان چەپڵەیان لێدا و هاواریان کرد.

ئالیس سەرجەمی بەسەرهاتەکەی بە بێواتا و پێکەنینی دەزانی، بەڵام قەڵافەتەکان هێندە جیددی بوون کە زاتی نەبوو پێبکەنێ و چونکە هیچیشی بۆ کوتن بە زەین نەگەیشت، تەنیا کڕنۆشی برد، ئەنگوستیلەکەی وەرگرت و حەولی دا هەتا ئەو جێگایەی دەتوانێ لە ڕووی مەندییەوە هەڵسوکەوت بکا.



دۆدۆ بە ڕێزی تەواوەوە ئەنگوستیلەکەی پێشکەشی ئالیس کرد.

بەرنامەی دوایی خواردنی نوقڵ بوو کە هەرا و زەنایەکی زۆری ساز کرد، چونکە باڵندە گەورەکان گلەییان کرد: نوقڵەکان ئەوندە چکۆلە بوون کە دەمیان دیویەتی و زگیان نەیدیوە، چکۆلەکانیش نوقڵەکە پەڕیوەتە قورڕوویان و کەوتوونەتە کۆخەکۆخ و چەند جار لە پشتیان داون. هەر چۆنێک بوو، بەسەرهاتەکە تەواو بوو و هەموویان جارێکی دیکە لە دەوری یەک دانیشتن و تکایان لە مشک کرد دیسان قسەیان بۆ بکات.

ئالیس وتی «بەڵێنیت دابوو بەسەرهاتەکەتم بۆ بگێڕیەوە.» چونکە ترساش دیسان مشک نارەحەت بێتەوە، بە منگەمنگ وتی «بشلێی بۆچی ڕقت لە سە... و پش...ە.»

مشک ڕووی لە ئالیس کرد، ئاخێکی هەڵکێشا و وتی «بەسەرهاتی من چیرۆکێکی درێژ و خەماوییە.»

ئالیس کە بە سەرسووڕمانەوە چاوی لە کلکی درێژی مشک دەکرد وتی «شکم لە درێژ بوونەکەیدا نییە، بەڵام بۆچی خەمهێنەر؟» کاتێکیش کە مشک خەریکی گێڕانەوە بوو، ئالیس هۆشی هەر لە لای کلکی مشکەکە بوو. هەربۆیە بەسەرهاتەکە لە زەینیدا بەم شێوەیە دەرهات:



بەسەرهاتی من چیرۆکێکی درێژەدار و خەمهێنەرە.

تووڕە بوو
سەگێ لە
دەستی مشکە،
"هەڵتدەواسم
- وتی -
بە کلک!
هەرئێستا وەرە
بچین بۆ
دادگا،
کردەوەکانت
ڕەشن
وەک عەبا
بێکارم ئەمڕۆ،
دەبێ بزانی،
من پێستت
دەڕنم هەر
بە ددانی؛
مشکە وتی
پێی: "قانوون
بخوێنە؛
هیچی تێناگەی،
دۆش دامەمێنە!
پێموایە کەللەت
پڕپڕە لە کا!
شاهید و
قازی پێ
ناوێ دادگا؟!
تووتکە بەوی
کوت: "بەسی‌کە
ئیدی!
بۆخۆم قازیم و
کلکم شاهیدی؛
تۆخماخی سەرت
هەر دەکەم ئەمن،
حوکمی تۆ:
پەتە و
دەچێتە
گەردنا"

«گوێت له من نییە!» مشکه به شێوەیەکی فەرماندەرانه قسەی دەکرد «هۆشت له کوێیه؟»

ئالیس به شەرمەزارییەوە وتی «زۆر ببوورە، پێموایه گەیشتبوویه پێچی پێنجەم.»

مشکه به توورەییەوە قیژاندی «گولۆلەت خستمه لێژی.»

ئالیس وتی «گلۆڵه؟» چونکه پێی خۆش بوو یارمەتی خەڵک بدات، چاوێکی له دەوروبەر کرد و وتی «من مامۆستای گلۆڵه کردنەوەم! ڕێگام بده یارمەتیت بدەم.»

مشکه هەستا وەڕێکەوت و وتی «ئیزنی هیچت نییە! تۆ بەم قسه قۆڕانەت خەریکه گاڵتەم پێ دەکەی.»

ئالیس پاڕاوە «خۆ من هیچ مەبەستێکم نەبوو، تۆش زۆر زوو زیز دەبی!»

مشکه له وەڵامدا بڕێک پرتەپرتی کرد.

ئالیس له دوای مشکەوە هەرای کرد «تکا دەکەم بگەڕێوە و بەسەرهاتەکەت تەواو که.» ئەوانی دیکەش یەکدەنگ وتیان «ئەرێ، بگەڕێوە.» بەڵام مشکه به جاڕزی سەری لەقاند و هەنگاوەکانی خێراتر کرد.

هەرکه مشک دوور کەوتەوە، تووتی هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی «سەد خۆزگه نەڕۆیشتبایه.» قرژاڵێکی پیریش دەرفەتی بۆ ڕەخسا و به کچەکەی وت «دیتت چاوەکەم! ئەمه ببێته پەندێکی باش بۆ تۆ که هەموو کات پشوودرێژ و لەسەرەخۆ بی.» قرژاڵی جحێڵ تەشەرێکی هاویشت «ئەو زمانه سوورەت مەسووڕێنه دایه! تۆ خۆت به تەنیا سەدەفێکی زەلام قەڵس دەکەی!»

ئالیس به دەنگی بەرز که لەگەڵ کەسێکی تایبەتیشی نەبوو وتی «بریا دایناى من لێره بوایه. زوو مشکەی دەگرت و دەیهێناوە.»

تووتی پرسیی «ڕووداریم نەکردبێ! دەکرێ بفەرمووی داینا کێیه؟»

ئالیس که زۆری پێ خۆش بوو به پشیلەکەیدا هەڵبڵێ، به خۆشحاڵییەوە وتی «داینا پشیلەکەمه که له ڕاوی مشکدا پسپۆڕە. ئەوە هیچ، بریا دەتدی چۆن به دوای باڵندەکان دەکەوێ! باڵندەکه هێشتا نەبزووتووە، داینا دەیقۆزێتەوە!»

ئەم قسانە کاریگەرییەکی بەرچاوی لە دەستەکەدا هەبوو. چەند باڵندە بە باڵەفڕکە ڕۆیشتن. قشقەڕەیەکی پیر بە جوانی خۆی داپێچا و وتی «کاتی ڕۆیشتنەوەیە. قورگم لە هەوای شەودا دێشێ.» قەناری بە دەنگی لەرزۆکەوە هەرای لە بێچووەکانی کرد «وەرن، هەناسەکانم! لە کاتی خەوەکەتان لای داوە.» هەموویان بە بیانووی جۆراوجۆرەوە ڕۆیشتن و زۆر زوو ئالیس بە تاقی تەنیا ماوە.

بە نارەحەتی و پەرۆشەوە بە خۆی وت «بریا زمانم لاڵ بوایە و باسی داینام نەکردایە. لەم خوارە کەس ددانی خێری پێدا ناهێنێ. بەڵام من دڵنیام داینا باشترین پشیلەی دنیایە! داینا! خۆشەویستەکەم! نازانم ئاخۆ دووبارە دەتبینمەوە یان نا!» ئالیسی بەستەزمان لەم قسانەدا بوو کە لەبەر تەنیایی و دڵتەنگی دایەوە لە قوڵپەی گریان. هەرچۆنێک بێ، ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی کە دیسان لە دوورەوە دەنگی پێی بیست و بە تاسەوە سەری بەرز کردەوە، بەو هیوایەی کە ڕەنگە مشکە، ڕای خۆی گۆڕیبێ و هاتبێتەوە بەسەرهاتەکەی بە تەواوی بگێڕێتەوە.



هەموویان بە بیانووی جۆراوجۆرەوە ڕۆیشتن.




*هەموویان بە بیانووی جۆراوجۆرەوە ڕۆیشتن.*

## بەشی چوارەم:
## کەرویشک لەقە لە بیل دەدا!

کەرویشکە سپییەکە بوو. بە هەڵبەزدابەز دەهات، دەتکوت شتێکی لێ ون بووە. بە نیگەرانی لە دەوروبەری دەڕوانی. ئالیس ئاگای لێ بوو کە لە ژێر لێوەوە دەڵێ: «خاتوون! خاتوون! پەنجە نازدارەکانم! سمێڵ و قژم! سوێندم بە فسۆسیی فسۆسەکان، سێدارەم بۆ هەڵدەواسێ! لە کوێم دانان؟» ئالیس خێرا زانی کەرویشکەکە بە دوای باوەشێن و دەسکێشەکانیدا دەگەڕێ و چونکە کچێکی دەروونپاک بوو، بۆخۆشی دەستی کرد بە گەڕان بەملا و ئەولادا. بەڵام باوەشێن و دەسکێشەکان لە هیچ کوێ دیار نەبوون؛ دەتکوت دوای مەلێ کردنی لە ئەستێرەکەدا، هەموو شتێکی ئەو شوێنە گۆڕاوە و تالارە گەورەکە و مێزی شووشەیی و دەرگا چکۆلەکە، هەر هەموویان ون ببوون.

زۆری پێ نەچوو کەرویشکەکە چاوی بە ئالیس کەوت کە خەریکە دەگەڕێ، بە تووڕەییەوە هەرای کرد: «ئێ! مێریئان! تۆ لێرە چ دەکەی؟ بە دوو هەنگاو بچۆ لە ماڵێ جووتێک دەسکێش و باوەشێنێکم بۆ بێنە! دەی زووکە!» ئالیس پەشۆکا و بەبێ ڕاوەستان، لەو شوێنەوە کە کەرویشک نیشانی دابوو تێیتەقاند. تەنانەت حەولی ئەوەشی نەدا کەرویشک لە هەڵەکەی ئاگادار بکاتەوە.




ئێ! مێری ئان! تۆ لێرە چ دەکەی؟

هەڵدەهات و بە خۆی دەوت «لەگەڵ خزمەتکارەکەی لێی گۆڕاوم! کاتێک بزانێ من کێم، حەتمەن لە بەر سەرسووڕمان شاخی لێ دەڕوێ. بەڵام ئێستاکە باشتر وایە دەسکێش و باوەشێنەکەی بۆ ببەم ـ هەڵبەت ئەگەر بیانبینمەوە.» لەم قسانەدا بوو کە گەیشتە بەرماڵێکی جوان و پاکوخاوێن کە لە سەر تابلۆی برنجی و بریسکەداری سەردەرانەکەی نووسرابوو «و. کەروێشک». بەبێ ئەوەی لە دەرگا بدا، چووە ژوورێ و هەڵات بۆ نهۆمی سەرەوە. لەوە دەترسا مێری‌ئانی ڕاستەقینە ببینێ و پێش ئەوەی باوەشێن و دەسکێشەکە بدۆزێتەوە، لە ماڵێ وەدەری بنێ.

لە دڵی خۆی‌دا وتی « چ سەیرە بە قسەی کەروێشک هەستی و دانیشی! پێم‌وایە دوایەش دەبێ گوێ لە فەرمانەکانی داینا بگرم.» دوایە بەسەرهاتەکەی لە زەینی‌دا کێشاوە «ئالیس، خێرا وەرە! دەمانەوێ بچینە دەرێ.» دوای قەدەرێک «خانمی پەرستار، ڕاوەستە! دەبێ ئاگام لەم کونە بێ، مشکی لێ نەیەتە دەرێ هەتا داینا دەگەڕێتەوە.» دوایە بیری کردەوە «بەڵام ئەگەر داینا بەم‌دەس و بەودەس دەستوور بە خەڵک بدا، پێم‌وایە بنەماڵەکەم دەری دەکەن.»

ئێستاکە گەیشتبووە دیوێکی چکۆلە و ڕێکوپێک کە لە پاڵ پەنجەرەکەی‌دا مێزێکی لێ بوو و لە سەر مێزەکە (هەروەک بە هیواشی بوو) باوەشێنێک و دوو سێ جووت دەسکێشی چەرمی سپی لێ بوو. باوەشێنێک و جووتێک دەسکێشی هەڵگرت، دەیویست لە دیوەکە بچێتە دەرێ کە چاوی بە بتڵێکی چکۆلە لە پاڵ ئاوێنەکەدا کەوت. ئەمجارەیان ڕستەی بمخۆوەی لە سەر نەنووسرابوو. کەچی ئالیس چێوپەمەی سەر بتڵەکەی لابرد و بردی بۆ لای دەمی. «هەرشتێک بخۆم یان بخۆمەوە، بێ‌ئەملا و ئەولا ڕووداوێکی خۆشم بۆ پێش دێ. با ئێستا بزانم ئەم بتڵە چی دەکا؟ بەشکم دیسان گەورە ببمەوە. بستەبالایی بەسە! تەواو وەڕەز بووم.»

هەرواش بوو. تەنانەت زۆر زووتر لەو کاتەی ئەو چاوەڕوانیی دەکرد: هێشتا نیوەی بتڵەکەی نەخواردبۆوە، دیتی سەری لە بن‌میچ کەوت. ناچار بوو بنووشتێتەوە هەتا ملی

نەشکێ. بە پەشۆکاوی بتڵەکەی دانا عەرزی و بە خۆی وت: بەسەا هیوادارم لەمە زیاتر گەورە نەبم. هەر ئێستاش بە درگادا ناچم.. بریا تۆزقاڵێک کەمترم بخواردایەتەوە.»

مخابن کە زۆر درەنگ بووا باڵای بەرز و بەرزتر بوو هەتا وای لێهات چۆک دادا. پاش ساتێک تەنانەت ڕێگا بۆ چۆکدادانیش نەبوو. لە سەر تەرکی دیوەکە ڕاکشا، ئانیشکی دەستێکی نووساند بە درگاکەوە و دەستەکەی دیکەشی لە دەوری سەری هاڵاند هەتا بزانێ جێگای دەبێتەوە؟ بەڵام ئێستاش هەر خەریک بوو گەورەتر دەبوو. دوایین ڕێگاچارە کە بە زەینی گەیشت ئەوە بوو دەستێکی لە پەنجەرەوە بباتە دەرێ و لاقێکی بخاتە کونی دووکەڵکێشی کوورەکەوە. دوایە بە خۆی وت «لەوە زیاتر هیچم لە دەست نایە. ئێستا چیم لێ دێ؟»

بە خۆشحاڵییەوە بتڵە چکۆلەکە بە تەواوی کاریگەریی جادوویی خۆی دانابوو و ئالیس گەورەتر نەبۆوە، بەڵام هەر ئاواش زۆر لە باشیدا نەبوو، چونکە دەیزانی ناتوانێ لە دیوەکە بچێتە دەرێ، خەمخواردنیشی بە کارێکی بێهۆ دانا.

ئەو بەستەزمانە بە خۆی وت: «ماڵی خۆمان زۆر باشتر بوو. لە پەستا گەورە و چکۆلە نەدەبوومەوە و هەر مشک و کەروێشکێک فەرمانی پێ نەدەدام. بریا نەچوومایە ئەو کونە کەروێشکەوە، بەڵام ـ بەڵام ئەوەش بڵێین ئەم جۆرە ژیانەش خراپ نییە. خودا دەزانێ چیم لێ قەوماوە. ئەو سەردەمەی چیرۆکەکانی شای پەرییەکانم دەخوێندەوە، پێم وا بوو ئەم شتانە ڕاست نین. ئێستاکە بۆخۆم ڕاست یەکێک لەو ڕووداوانەم بە سەر هاتووە. دەبێ سەبارەت بە منیش کتێب بنووسن، حەتمەن دەبێ بینووسن! هەر بۆخۆم، کاتێک گەورە بووم دەینووسم!» بە خەمناکییەوە درێژەی بە قسەکانی دا «بەڵام هەر ئێستاکەش گەورەم! خۆ ئێرەش جێگاکەی وا نییە لەوە گەورەتر ببم.»

دوایە بیری کردەوە «یانی تەمەنیشم زۆرتر نابێ؟ لە لایەکەوە خراپ نییە، چونکە هیچ کات پیر نابم، بەڵام ـ بەڵام لە لایەکەوە ناچارم هەمیشە دەرس بخوێنم! ئەوەم هەر پێ خۆش نییە!»

لە وەڵامی خۆیدا وتی «هەی گەوجەکچ! لێرە چۆن دەکرێ دەرس بخوێنی؟ لێرە خۆت بە زەحمەت جێت بۆتەوە، چ بگا بە کتێب و دەفتەر!»

هەروا درێژەی پێ دا. جاری وا بوو لایەنی خۆی دەگرت، جاری واش بوو لایەنی ئەوی دیکە! بە کورتی بە تاقی تەنیا وتووێژێکی دوو کەسەی ساز کردبوو. بەڵام دوای چەند دەقە، لە دەرەوە دەنگێکی بیست، بێدەنگ بوو و گوێی دایە.

«مێرئان! مێرئان! خێرا دەسکێشەکانم بۆ بێنە!» دوایە تەپەتەپی هەنگاوەکانی لە سەر پلیکانەکان بیسترا. زانی کەروێشکەکە بە دوایدا دەگەڕێ، هێندە بە توندی لەرز دایگرت کە ماڵەکەشی پێوە لەرییەوە. ئالیس هەر لە بیریشی نەبوو ئێستاکە خۆی هەزار ئەوندەی کەروێشکی لێ هاتووە و ئیدی لە خۆڕا دەترسێ.

کەروێشک گەیشتە پشت درگاکە و ویستی بیکاتەوە. بەڵام چونکە درگاکە بەرەو ژووری دەکراوە و ئانیشکی ئالیسیش بە تەواوی پێوەی نووسابوو، حەولەکەی بێکەڵک بوو. ئالیس گوێی لە قسەی کەروێشک بوو «ئەم حاڵە بەو حاڵە ناشێ، دەگەڕێمەوە و لە پەنجەرەوە دەچمە ژوورێ.»

ئالیس بە خۆی وت «خەیاڵت خاوە!» چاوەڕێ ما. هەرکە لە ژێر پەنجەرەکەوە دەنگی کەروێشکی بیست، خێرا قامکەکانی لێک کردنەوە و لە حەوا پڕی پێدا کرد. هیچی بە دەستەوە نەهات، بەڵام قیژەیەکی کورتی بیست، هەروەها دەنگی بە عەرزدا کەوتن و خرمەی شووشە. لەمانە بەم ئاکامە گەیشت کە ڕەنگە کەروێشکەکە کەوتبێت بە سەر شووشەبەندی گەرمخانەی خەیار یان شێتکی لەو شێوەیەدا.

دوایە هاوارێکی تووڕەی بیست ـ کەورێشکەکە بوو ـ «پەت! پەت! لە کوێی؟» دوایە دەنگێک هات کە ئالیس بۆ یەکەمین جار بوو دەیبیست «ئەوەتام! لێرەم گەورەم! خەریکم سێو **دەجوورم**!»

کەروێشک بە تووڕەییەوە وتی «سێو **دەجوورم**! تەح! وەرە! وەرە یارمەتیم بدە لێرە بێمە دەرێ!» (دیسان خرمەی شووشە)

«پەت! ئێستاکە بڵێ لە نێو پەنجەرەکە چی دەبینی؟»

«چی دەبینم گەورەم؟ دەی دیارە، باسکێک.» (پەت کوتبووی باسسسک)
«باسک؟ نەفام! کێ باسکی بەم زلیەی دیوە؟ تەواوی پەنجەرەکەی گرتووە.»
«دەی دیارە گرتوویەتی گەورەم، بەڵام ئاواش هەر باسکە.»
«هەر چۆنێک بێ، ئێرە جێگای ئەو نییە! بڕۆ لایبە!»

بۆ ماوەیەکی باش بێدەنگی وڵاتی داگرت، جارجارە نەبێ کە ئالیس گوێی لە ورتەورتێک دەبوو. وەکوو «جا دیارە، هەر پێم خۆش نییە، گەورەم! هەر بە دڵم نییە!» «هەرچی دەیڵێم بیکە! ترسەنۆک!» هەتاکوو دیسانەکە ئالیس مشتی کردەوە و پڕێکی دیکەی پێدا کرد. ئەمجار دوو قیژەی کورتی بیست و دیسانەکەش خرمەی شووشە. بیری کردەوە «مەگەر ئەمانە چەند دانە گەرمخانەی خەیاریان هەیە؟» دوایە بە خۆی وت «خودا دەزانێ ئێستاکە دەیانهەوێ چی بکەن. ئەگەر دەیانهەوێ من لە پەنجەرەکەوە بێننە دەرێ، خۆزگە سەردەکەوتن. خۆشم ئیدی پێم خۆش نییە لەوە زۆرتر لێرە بمێنمەوە.»

بڕێک ڕاوەستا، هیچی نەبیست. ئاخری دەنگی جیرەجیری تەگەری عارەبانەیەکی چکۆلە و هێندێک پچەپچ هات کە پێکەوە قسەیان دەکرد.

ئەم ڕستانەی بە پچڕپچڕ گوێ لێ بوو «نەردیوانەکەی دیکە کوا؟ ـ سەیرە! بە منیان وت دانەیەک بێنم. ـ ئەوی دیکە لای بیلە. ـ کوڕە بیل، خێرا بچۆ بیهێنە! ـ لێرە! هەردووکیان لەم سووچە دانێن! ـ نا، لە پێشدا لێکیان ببەستن! ـ ئاگاتە نیوەشی! ـ ئەی هاوار، باشە، گوێی مەدەیە! بیل، وەرە سەری ئەم گوریسە بگرە! ـ سەربانەکە خۆ ڕادەگرێ؟ ـ ئاگات لەو بەردە لەقە بێ! ـ ئۆۆۆخ، کەوت! ـ سەرتان لابەن!» (تلپەی کەوتنی شتێک!) «کێ وای کرد؟ ـ پێم وا بێ بیل بوو ـ کێ لە دووکەڵکێشەکە دەچێتە خوارەوە؟ ـ کاری من نییە! ـ تۆ بچۆ! ـ هەرباسیشی مەکە! ـ کەوایە با بیل بچێ! ـ وەرە ئێرە بیل! ـ ئەرباب دەڵێ تۆ دەبێ لە دووکەڵکێشەکە بچیە خوارەوە.»




پەت! ئێستاکە بڵێ لە نێو پەنجەرەکە چی دەبینی؟

ئالیس بە خۆی وت «ئاوا! کەوایە دەبێ بیل لە دووکەڵکێشەکە بێتە خوارەوە! پەح! هەموو کارەکان دەخەنە ئەستۆی بیل! قەتم پێ خۆش نییە لە جێی بیل بم. ئەم کوورە دیوارییە زۆر تەنگەبەرە، بەڵام پێموایە دەکرێ بڕێک لەقەفرتێ بکەم.»

لاقی کە لە نێو دووکەڵکێشی ئاگردانەکەدا بوو، هەتاکوو بۆی کرا هێنایە خوارێ و ڕاوەستا تاکوو لە نزیکەوە دەنگی حەول و تەقەلا و چنگەکرێی گیانلەبەرێکی چکۆلەی لە نێو دووکەڵکێشەکەدا بیست (نەیدەزانی چ گیانلەبەرێکە) وتی «خۆیەتی!» خێرا لەقەیەکی توندی بەرەو سەرێ هاویشت و چاوەڕێی ئاکامەکەی ما.

یەکەم شت کە بیستی ئەم هاوارە تێکڕایە بوو: «بیل حەوا درا!» دواتر دەنگی کەروێشک بە تەنیایی «بیگرنەوە! هۆی، ئێوە! لای پەرژینەکە!» دوایە بێدەنگی، دوایە دیسان دەنگی تێکەڵپێکەڵ، «سەری هەڵێنە! ـ ئاوی پێ بدە! ـ ئاگات لێ بێ! پەرپییە قوڕووی! ـ کوڕە چی ڕووی دا؟ بیگێڕەوە!»

ئاخری بە ئاستەم زیکەزیکێکی بیست. (ئالیس بە خۆی وت «ئەوە دەبێ بیل بێ.») «هەر بەڕاست زۆر باش تێنەگەیشتم ـ دەستت خۆش بێ بۆ ئاوەکە، باشتر بووم ـ ئێستاش هەر گێژوویژم ـ دەتکوت شتێکی وەک فەنەر لێم درا و وەکوو فیشەک چووم بە حەوادا!»

ئەوانی دیکە وتیان «هەتیو، ڕاست وایە!»

«دەبێ ماڵەکە ئاور تێبەردەین!» دەنگی کەروێشک بوو. ئالیس بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری کرد «ئاوری دەن، جا بزانن داینا دەنێرمە جەستەتان یا نا؟»

لەپڕ بێدەنگی وڵاتی داگرت. ئالیس بە خۆی وت «نازانم ئێستا دەیانەوێ چی بکەن؟ ئەگەر هەر کەمێک ئەقڵیان هەبێ، بنمیچەکە لادەبەن.» یەک دوو چرکە دواتر دیسانەکە هاتوچۆ دەستی پێکردەوە و ئالیس دەنگی کەروێشکی بیست کە دەیکوت «بۆ سەرەتای کار، قرتاڵەیەکی پڕمان بەسە!»




بیل حەوا درا!

ئالیس بیری کردەوە «قرتاڵەیەکی پڕ لە چی؟» سەرلێشێواوییەکەی زۆری نەخایاند، چونکە دوای ماوەیەکی کورت، بارانەی وردکە بەرد لە پەنجەرەوە ڕژانە ژووریٚ و چەند دانەش لە سەروچاوی کەوتن. بە خۆی وت «پێشیان دەگرم!» قیژاندی «تەواوی کەن!» خێرا بێدەنگییەکی بەسام وَڵاتی تەنی.

ئالیس بە سەرسووڕمانەوە دیتی هەرکە وردە بەردەکان دەکەونە تەرکی دیوەکە، دەبن بە شیرینی. بیرێکی نویٚ بە مێشکیدا هات؛ بە خۆی وت «ئەگەر دانەیەک لەم شیرینییانە بخۆم، حەتمەنە قەڵافەتم دەگۆڕیٚ، چونکە ناتوانیٚ گەورەترم بکاتەوە، کەوایە چکۆلەترم دەکاتەوە ـ پێموایە.»

دوایە شیرینییەکی قووت دا، زۆری پیٚ سەیر بوو کە دیتی هەر خێرا چکۆلە بوونەوە دەستی پیٚکرد. هەرکە قەوارەکەی وای لیٚ هات کە لە درگاکەوە بچیٚ، لە ماڵ دەرپەڕی و لووتی بە لووتی پۆلێک باڵندە و ئاژەڵی چکۆلەدا تەقی کە لە حەوشە چاوەڕیٚ بوون. مارمێلکە بەستەزمانە چکۆلەکە کە بیل بوو، لە نێوەڕاستی هەموویان ڕاوەستابوو. دوو کوودەڵەی هێندی دەستیان نابووە ژێر هەنگڵی و بە بتری شتێکیان دەکرد بە گەروویەوە. هەر سەروسەکوتی ئالیس وەدیار کەوت، هەموو هاشاوڵیان بۆ هێنا، بەڵام ئالیس زۆر زوو تێی تەقاند و خێرا بە سلامەت، خۆی گەیاندە نێو دارستانێکی چڕوپڕ.

«یەکەم کار کە دەبیٚ بیکەم، ئەوەیە کە دیسان دەبیٚ بگەڕێمەوە سەر دۆخی سەرەکیی خۆم» لە دارستانەکەدا دەگەڕا و قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد «ـ دووهەم کار ئەوەیە دەبیٚ ڕێگای ئەو باخە جوانە ببینمەوە. پێموایە پلانێکی باشم داناوە.»

پلانەکەی زۆر جوان بوو. زۆر ساکار و ڕێکوپێکیش دارێژرابوو. تەنیا عەیبەکەی ئەوە بوو کە هەر نەیدەزانی لە کوێوە دەستپیٚبکا؛ هەروا کە نیگەران و گویٚقولاغ بە نێو دارەکاندا دەگەڕا، دەنگی گەفووەڕێکی کورت و تیژ، ڕاست لە سەرەوە سەری بەرەو حەوا بەرز کردەوە.




مارمێلکە بەستەزمانە چکۆلەکە کە بیل بوو، لە نێوەڕاستی هەموویان ڕاوەستابوو.

تووتکەسەگێکی زەلام سەری دانەواندبوو و بە چاوی خڕ و زلەوە لێی دەڕوانی؛ بە ئارامی دەستێکی هێنابووە پێشێ هەتا چڕنووگ لە ئالیس بگرێ. ئالیس وەک هەڵخەڵەتاندن وتی «بەستەزمانە بیچکۆلەکە!» دوایە بە هەزار ناری عەلی حەولی دا کوتکوتی بۆ بکا. بەڵام لەوە دەترسا سەگەکە برسی بێ، کە ئەگەر وا بوایە، سەرەڕای ئەم هەموو ناز کردنە، بیگاتە تیکەیەک و هەڵمەقووتی بکا.

ئالیس خۆیشی نەیزانی چۆن بوو دارێکی هەڵگرت و بۆ لای تووتکە سەگەکەی حەوا دا. تووتکە سەگ لە خۆشیانا وەڕی و بە هەر چوار دەست و پێ هەڵیخستەوە. لە حەوا دارەکەی قۆزتەوە و کەوتە کرووسانەوەی. ئالیس لە ترسی ئەوەی نەکەوێتە ژێر دەست و پێی، هەڵاتە پشت گوێنییەکی گەورە. هەرکە لەوبەری گوێنییەکەوە سەری هەڵبڕی، دیتی تووتکەکە قەڵەمبازێکی دیکەی بۆی لای دارەکە دا و لە پەلەپەلدا بە سەرەوە کەوت بە عەرزدا. ئالیس دیسان خۆی لە پشت گوێنییەکە مات کرد. وای دەزانی لەگەڵ ئەسپێکی داشقە کایە دەکا و هەر کات‌وساتێک لەوانەیە ببێ بە ژێرەوە. تووتکە سەگەکە لە پەستا هاشاوڵی بۆ دارەکە دەبرد. هەموو جارێک کەمێک دەچووە پێشێ، دوایە زۆر زیاتر دەکشاوە و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بە توندی حەپەحەپی دەکرد و دەیهاسکاند و زمانی دەرهێنابوو و چاوە زەقەکانی نیوە ئاوەڵا بوون.

بە بڕوای ئالیس، ئێستاکە باشترین دەرفەت بوو بۆ هەڵاتن. تێی‌تەقاند و ئەوندە هەڵات هەتا ماندوو بوو و کەوتە هەناسەبڕکێ، وەڕەوەڕی سەگەکەش دوورتر و کەمتر دەبوو.




تووتکە سەگ لە خۆشیانا وەڕی و بە هەر چوار دەست و پێ هەڵیخستەوە.

«ئەمانە هەمووی بە جێی خۆی، چەندە سەگێکی چکۆڵانە و ژیکەڵانە بوو!» پاڵی دابوو بە لاسکی هەلاڵەیەکەوە و بە گەڵاکانی، خۆی فێنک دەکردەوە. «پێم خۆش بوو هێندێک فێڵ و تەڵەکەی فێر بکەم، ئەگەر ... ئەگەر قەوارەم بۆ ئەم کارە بە کەڵک بهاتایە. خودایە گیان! خەریک بوو لە بیرم بچێتەوە، دەبێ گەورە ببمەوە! ڕاوەستە بزانم، چۆن دەبێ ئەو کارە بکەم؟ پێموایە دەبێ شتێک بخۆم یان بخۆمەوە. بەڵام نازانم چی؟»

کێشەی سەرەکی ڕاست ئەوە بوو: چی؟ ئالیس چاوێکی بە دەوروبەردا گێڕا، لە گوڵەکان و لاسکەکانیان خورد بۆوە. بەڵام شتێکی وای نەدی کە لەم بارودۆخەدا ڕاست ئەو شتە بێ کە دەبێ بیخوا یان بیخواتەوە. لە پەنای‌دا کارگێکی گەورە هەڵتۆقیبوو، کەم‌تاکورتێ بە قەد خۆی دەبوو. ئالیس چاوی لە ژێر کارگەکە کرد، چاوی لە هەر دوو لای کارگەکە کرد، پشتەوەی کارگی چاو لێ‌کرد و بیری کردەوە: ئێستاکە کە هەموو لایەکی کارگەکەی دیوە، وا باشە چاوێکیش لە سەر کارگەکە بکا.

هەستا سەر پەنجە و لە لێواری کارگەوە ڕوانی، لە پڕ لووتی تەقی بە لووتی کرمە هەورێشمێکی شین و گەورەدا کە دەست لە سەر سینگ لە سەر کارگەکە دانیشتبوو، بە ئارامی قلیانی دەکێشا و هۆشی نە لای ئالیس بوو نە لای هیچ شتێکی دیکە.

## بەشی پێنجەم:
# ئامۆژگاری کرمی هەورێشم

کرمی هەورێشم و ئالیس ماوەیەک بە بێدەنگی چاویان لە یەک بڕی. ئاخری کرمەکە قامیشی قلیانەکەی لە دەمی دەرهێنا و بە خوماری و خەواڵوییەوە بە ئالیسی وت «تۆ کێی؟»

ئەمە بۆ وتووێژ کردن سەرەتایەکی هەستبزوێن نەبوو. ئالیس بە پارێزەوە وتی «ڕاستییەکەی ... ڕاستییەکەی خۆشم نازانم گەورەم! مەبەستم ئێستای خۆمە ـ لانیکەم دەزانم بەیانی کە لە خەو هەستام، کێ بووم! بەڵام لەو کاتەوە هەتا ئێستا چەند جاران گۆڕاوم.»

کرمی هەورێشم بە ڕووگرژییەوە وتی «مەبەستت چییە؟ خۆت لە خۆت حاڵی هەی؟»

ئالیس وتی «گەورەم بە داخەوەم، خۆشم سەرم لێ شێواوە، چونکە ئەمن خۆم نیم، تێگەیشتی؟»

کرمی هەورێشم وتی «تێنەگەیشتم!»

ئالیس بە ئەدەبەوە وتی «بە داخەوە ناتوانم لەوە ڕوونتر باسی بکەم، چونکە خۆشم سەرم لێ شێواوە. ئەم هەموو گەورە و چکۆلە بوونەوە لە ڕۆژێکدا تەواو گێژت دەکا.»

کرمی هەورێشم وتی «نایکا.»




کرمی هەورێشم و ئالیس ماوەیەک بە بێدەنگی چاویان لە یەک بڕی.

ئالیس وتی «دەی، ڕەنگە ئێستاش بۆ ئێوە وا نەبێ. بەڵام کاتێـک بە ناچـاری چـوویتە نێو کەلووەوە و بووی بە کرمی تەتڵەمیران، دوایەش بووی بە پەپوولە، ـ ڕۆژێک هەر وات لێ دێ ـ پێموایە هەستێکی سەیر داتدەگرێ، وا نییە؟»

کرمی هەورێشم وتی «قەت قەت!»

ئالیس وتی «دەی، ڕەنگە هەستی تۆ جیاوازی هەبێ. تەنیا دەزانم بۆ من شـتێکی زۆر سەیر دەبێ.»

بەم پرســیارە هەردووکیــان گەڕانەوە ســەرەتای وتوویــژەکە. ئـالیس کە لە وەڵامە پچرپچڕەکانی کرمی هەورێشم بڕێک دڵمەند ببوو، خۆی ڕاست کـردەوە و زۆر بە جیـددی وتی «پێموایە وا باشترە لە پێشدا پێم بڵێی بۆخۆت کێی؟»

کرمی هەورێشم وتی «بۆچی؟»

ئەمەش پرسیارێکی ئـاڵۆزی دیـکە. کاتێـک ئـالیس هـیچ هـۆیەکی شـیاوی بە زەیـن نەگەیشت و کرمی هەورێشمیش دەتکوت خولقی هیچ خۆش نییە، هەستا بڕوا.

«بگەڕێوە!» کرمی هەورێشم لە دوایەوە هەرای لێ کرد. «دەمەوێ شتێکی گرینگت پێ بڵێم!»

بە دڵنیاییەوە بەڵێنییەکی پڕ لە هیوا بوو. ئالیس گەڕاوە.

کرمی هەورێشم وتی «پشوودرێژ و لەسەرەخۆ بە!»

ئالیس وتی «هەر ئەوە؟» بە هەزار ناری عەلی تووڕەییەکەی خۆی خواردەوە.

کرمی هەورێشم وتی «نا.»

ئالیس بیری کردەوە: خۆ ئێستاکە کارێکی دیکەی نییە، دەیجا وا باشە چـاوەڕێ بـێ، بەشـکوو کرمـی هەورێشـم شـتێک بڵـێ کە بایــخی ئەو گـوێڕاگرتنەی هەبـێ. کرمـی هەورێشم چەند دەقە بەبێ ئەوەی متەقی لێـوە بـێ، مـژی لە قلیـانەکەی دا هەتـا ئـاخری دەستی لێک کردەوە و لوولەی قلیانی لە دەمی دەرهێنـاوە و وتـی «کەوایە تـۆ پێـت وایە گۆڕاوی، وایە؟»

ئالیس وتی «بە داخەوە هەر وایە، گەورەم! ئەو شتانەی دەمزانی، نایەنەوە بیرم ـ لە سەر یەک، دە دەقە لە قەوارەیەکدا نامێنمەوە!»

کرمی هەورێشم وتی «چیت لە بیرە؟»

ئالیس زۆر بە خەمناکی وەڵامی داوە «دەی، حەولم دا شێعری هەویری بە موو لە بەر بخوێنمەوە، کەچی هەمووی گۆڕابوو.»

کرمی هەورێشم وتی «شێعری بابە ویلیام بخوێنەوە.»

ئالیس دەست لە سەر سینگ وتی:

## بابە ویلیام

«گەرچی پیری» لاوە وتی بە بابە:
«سەر و ڕیشت سپی وەک چۆڕی شیرە
بەو عومرەوە تۆ سەرمەقولات لێدەدەی
بژی بۆ هێز و ئەقڵت مامەپیرە!»

«ئەو کاتە لاو بووم» بابە ویلیام وتی
«من پێم وا بوو کاس و بێمێشکم دەکات
ئێستاکە دڵنیام لە بێمێشکی خۆم
پەیتا پەیتا من لێدەدەم سەرمەقولات»



*بەو عومرەوە تۆ سەرمەقولات لێدەدەی!*

«گەرچی پیری» دیسان ئەو لاوە پێی وت
«قەڵەو بووی، دەڵێی شەکی دابەستەی
بەڵام پێم سەیرە چۆن بەبێ ڕاوەستان
لە ژوورێدا سەرمەقولات لێدەدەی؟»

«ئەو کاتە لاو بووم» بابە ویلیام وتی
«هەویرکوتم لە جومگەم ساویوە
قیمەتی هەر قوتوویەک سنارێکە
بمدەوە پارەکەی، بە تۆم بەخشیوە!»

«گەرچی پیری» دیسان ئەو لاوە پێی وت
«چیت بۆ دەخورێ بەو پووکە بێ ددانەوە؟
خواردنی تۆ بە تەنیا هەڵوایە و بەس،
چۆن قووت دەدەی قازێ بە یەسقانەوە؟»

«ئەو کاتە لاو بووم» بابەویلیام وتی
«من قانوونم خوێندووە، پارێزەرم
هێند چەنەم لێدا لەگەڵ خێزانەکەم،
وای دەهارم، چەشنی ئاشی ئاورم»

«گەرچی پیری» پێی وت ئەو، «چاوانی تۆ
هێندە زیتن، من سەرم سوورماوە لێی
ئەو کەپۆیە و شارەزاییت هی چییە
وا کە مارماسی لە بانی دادەنێی؟»

«ئاخ لە دەستی تۆ» بابەویلیام وتی
«لەو هەموو پرسیارە، تۆ دەست هەڵگرە
یان بە خۆشی دوور کەوە و واز بێنە لێم
یان لە بەر مست و شەقم خۆ ڕاگرە»




واکە مارماسی لە بانی دادەنێی

کرمی هەورێشم وتی «دروستت نەخوێندەوە.»

ئالیس بە شەرمەزارییەوە وتی «بەڵێ، بە داخەوە زۆر دروست نەبوو. هێندێک لە وشەکان گۆڕاون.»

کرمی هەورێشم لێبڕاوانە وتی «داری بە سەر بەردییەوە نەمابوو.» چەند دەقە بێدەنگ بوون. ئەو کەسەی دیسان سەری قسەی کردەوە، کرمی هەورێشم بوو.

پرسیی «پێت خۆشە قەوارەت چەندە بێ؟»

ئالیس بەپەلە وەڵامی داوە «ئەندازەکەی گرینگ نییە، بەڵام پێم خۆش نییە هەر ساتەی بە جۆرێک بم، تێگەیشتی؟»

کرمی هەورێشم وتی «نەگەیشتم!»

ئالیس هیچی نەکوت. لە عومراتیدا هیچ کات کەسێک ئەوندەی دژایەتی لەگەڵ نەکردبوو، ئیدی خەریک بوو قەڵس بێت.

کرمی هەورێشم پرسیی «ئەندازەی ئێستات بە دڵە؟»

ئالیس وتی «کەمێک لە ئێستاکەم گەورەتر بوایەم باشتر بوو، گەورەم، ئەگەر جێبەجێ بێتا ئاخر حەوت سانتیمیتر باڵا، ئەندازەیەکی زۆر نالەبارە!»

«ئەندازەیەکی زۆر باشیشە!» کرمی هەورێشم بە تووڕەیی ئەمەی وت و خۆی ڕاستەوە کرد. (قەوارەی خۆی، ڕاست حەوت سانتیمیتر بوو.)

ئالیسی بەستەزمان کەوتە لالانەوە. «بەڵام من خووم بەم قەوارەیە نەگرتووە.» لە دڵیشیدا وتی «بریا ئەم بوونەوەرانە ئەوندە دڵناسک نەبوایەن.»

کرمی هەورێشم وتی «وردە وردە خووی پێ دەگری.» لوولەی قلیانەکەی بۆ دەمی برد و دەستی کردەوە بە مژ لێدان.

ئالیس ئەمجارەیان بڕێک ددانی بە جەرگدا گرت هەتا کرمی هەورێشم وەقسە هاتەوە. یەک دوو دەقە دواتر کرمەکە، قامیشی قلیانەکەی لە دەمی دەرهێنا، یەک دوو جارێک باوێشکی دا و خۆی کێشاوە. دوایە لە کارگەکەوە خۆی خزاندە خوارێ. خزیە نێو

گیاوگژەکانەوە و هەروا کە خەریک بوو دوور دەکەوتەوە، وتی «ئەم لایەی باڵات بەرز دەکا، ئەو لایەی دیکە چکۆلەت دەکاتەوە.»

ئالیس بە خۆی وت «ئەم لایەی چی؟ ئەو لایەی چی؟»

کرمی هەوریشم وتی «کارگە.» هەر ڕاست وەک بڵێی ئالیس بە دەنگی بەرز پرسیاری کردبێ؛ دوایە لە نێو گیاوگژەکەدا ون بوو.

ئالیس ماوەیەکی باش سەرنجی دایە کارگەکە. خەریکی لێکدانەوەی دوو لایەکەی بوو. چونکە کارگەکە تەواو خڕ بوو، زانیی تووشی گرفتێکی گەورە بووە. هەرچۆنێک بێ، باسکی بڵاو کردەوە، هەتا ئەو جێیەی بۆی کرا، باوەشی بە دەوری کارگەکەدا کرد و بە هەر دوو دەست لە هەر دوو لاوە لەتێکی لێ کردەوە.

بە خۆی وت «ئێستا چی بە سەر چییەوەیە؟» قەپێکی لە لەتەکەی دەستی ڕاستی گرت هەتا کاریگەرییەکەی تاقی بکاتەوە. هێندەی پێ نەچوو، زەبرێکی قورس لە ژێر چەناگەی درا. چەناگەی بە لاقیەوە نووسابووا

لەم گۆڕانە لەناکاوە زۆر ترسا بەڵام بیری کردەوە بۆ ئەوە نابێ کات بە فیڕۆ بدات، چونکە خەریک بوو زۆر خێرا چکۆلە دەبۆوە. خێرا دەست بە کار بوو هەتا گازێک لە لەتەکەی دیکە بگرێ بەڵام چەناگەی وا بە لاقیەوە نووسابوو کە نەیدەتوانی دەمی بکاتەوە؛ ئاخری هەر چۆنێک بوو دەمی کردەوە و گازێکی لە لەتەکەی دەستی چەپی گرت.



«ئۆخەیش! ئاخری سەرم ڕزگاری بوو!» ساتێک دواتر خۆشحاڵییەکەی لێ تاڵ بوو و دڵەڕاوکێ کەوتە کەوڵی، چونکە دیتی شانەکانی دیار نین. لەو بەرزاییەوە ڕوانی و تەنیا شتێکی کە دیتی، کۆمایەکی زۆر گەڵای سەوز بوو کە لەو خوارانەوە شەپۆلیان دەدا و لە نێوەڕاستییەوە ملێکی درێژ وەکوو لاسک سەری دەرهێنابوو.

«ئەم هەمووە سەوزاییە چییە؟ کوانێ شانەکانم؟ ئۆی، دەستە خنجیلانەکانم! بۆ ناتانبینم؟» هەر قسەی دەکرد و دەستی لەملا و ئەولا دەکوتا کە وا دیار بوو هیچ ئاکامێکی نەبوو، بێجگە لە کەمێک پرژ و بڵاو کردنەوەی گەڵا سەوزە دوورەکان.

کاتێ لێی روون بۆوە هیچ رێگایەک نەماوە بۆ ئەوەی دەستی لە سەر سەری دانێ، حەولی دا سەری بەرەو لای دەستی ببا. کاتێک دیتی ملی وەکوو مار، بە هاسانی بۆ هەموو لایەک وەردەسوورێ، خۆشحاڵ بوو. تازە توانیبووی ملی بە پێچودەرێکی رێکوپێک بباتە خوارەوە؛ دەیویست بە گوپلێدان خۆی فرێداتە نێو ئەو گەڵایانەی کە ئێستاکە زانیبووی سەرلقی ئەو دارانەن وا لە ژێریدا پیاسەی کردبوو، بەڵام دەنگێکی تیژی وەکوو فیتوو لە کارەکەی گێڕاوە. کۆترێکی گەورە بەرەو لای فڕیبوو و زۆر درندانە باڵی لە دەموچاوی دەکوتا.

کۆتر هاواری کرد «مار!»

ئالیس بە جاڕزییەوە وتی «من مار نیم! لە کۆڵم بەوە!»

کۆتر وتی «هەر ئەوەی کە وتم! مار!» بەڵام ئەمجارەیان هێمنانەتر وتی. دوایە بە بوغزەوە وتی «هەر کارێک دەڵێی کردوومە! بەڵام وا دیارە بە هیچ شتێک رازی نابن!»

ئالیس وتی «تەقە لە سەرمەوە دێ!»



کۆتر هاواری کرد «مارا!»

«ڕیشەی دارەکانم تاقی کردەوە، کەنار چۆمەکانم تاقی کردەوە، پەرژینەکانم تاقی کردەوە» کۆترەکە بێئەوەی گوێی لە ئالیس بێ، قسەی دەکرد «بەڵام هاوار لە دەستی ئەم مارانە! بە هیچ شتێک ڕازی نابن!»

ئالیس سات بە سات گێژتر دەبوو، بەڵام بیری کردەوە هەتا قسە کردنی کۆتر تەواو نەبێ، قسە کردنی خۆی بێکەڵکە.

کۆتر وتی «زەحمەتی هێلکە کردن لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە، دەبێ دوایەش دایمودەرهەم نیگەرانی مار بم. خودا دەزانێ، لەم سێ حەوتووەدا خەو بە چاومدا نەهاتووە!»

ئالیس کە تازە خەریک بوو لە مەبەستەکە دەگەیشت، وتی «چەند ناخۆشە، ئەو هەمووە ئازارەت چێشتووە.»

کۆتر زیقاندی «ئێستاش ڕاست لەو کاتەدا کە بەرزترین داری دارستانم دیتەوە، ڕاست زەمانێک کە پێم وا بوو لە چنگیان ڕزگارم بووە، ئەوەتا دەبینم لە ئاسمانەوە بە باوەخولێ هاتۆتە خوارێ! ئەح ماری گلاو!»

ئالیس وتی «بەڵام پێم وتی من مار نیم! من ـ من ـ»

کۆتر وتی «ئەگەر وایە، تۆ چیت؟ ئەوە نییە حەول دەدەی شتێک بسازێنی!»

ئالیس وتی «من... من کچۆڵەیەکم.» زۆر دڵنیا نەبوو، چونکە گۆڕانە زووبەزووەکانی ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتەوە.

«بەڵێ، قسەکەت زۆر جوانە!» ڕاوێژی کۆترەکە سووکایەتی تێدا بوو. «لە تەمەنی خۆمدا کچۆڵەم زۆر دیوە بەڵام تەنانەت دانەیەکیشیان ملی ئاوا نەبووا نا، نا! تۆ ماری! پێویست ناکا بیشاریتەوە! پێموایە دوایەش دەڵێی هەتا ئێستا مێلاکی هێلکەی باڵندەت نەکردووە!»

ئالیس کە منداڵێکی زۆر ڕاستبێژ بوو، وتی «چۆنم نەخواردووە! بەڵام چاو لێکە، مارەکان چەندە هێلکەی باڵندە دەخۆن، کچۆڵەکانیش هەر ئەوندە هێلکەی مریشک دەخۆن.»

کۆتر وتی «بڕوا ناکەم! جیا لەوە، ئەگەر ڕاستیش بکەی، کەوایە ئەوانیش جۆرێک مارن. هەر قسەکەی خۆمە!»

ئەم بیرۆکەیە بە لای ئالیسەوە هێندە تازە بوو کە یەک دوو دەقە بێدەنگ ما و دەرفەتی بە کۆتر دا هەتا بڵێ «تۆ بە دوای هێلکەی باڵندەدا دەگەڕێی، لەم بابەتەوە تەواو دڵنیام، کەوایە بۆ من چ جیاوازییەکی هەیە تۆ مار بی یان کچکۆڵە!؟»

ئالیس تووڕە بوو «بەڵام جیاوازییەکی زۆری هەیە، چونکە خوداوڕاستان بە دوای هێلکەدا نەدەگەڕام، ئەگەر بشگەڕابایەم کارم بە هی تۆ نەبوو. من شتی کاڵ و نەکوڵیوم پێ خۆش نییە.»

کۆتر بە تووڕەیی‌یەوە وتی «کەوایە شەپێک لە خۆت هەڵدە و بڕۆ.» دوایە چووە نێو هێلانەکەی. ئالیس بە حەولێکی زۆر خۆی لە نێو دارەکانەوە هێنا خوارێ، چونکە ملی لە پەستا لە نێو لقەکاندا گیری دەکرد و ناچار بوو ڕاوەستێ و ملی دەربێنێ. دوای ماوەیەک وەبیری هاتەوە کە هێشتا لەتە کارگەکەی لە نێو مستی‌دا ڕاگرتووە. بەوپەڕی پارێزەوە دەستی پێ‌کرد. سەرەتا تۆزقاڵێکی لە لەتێک خوارد، دوایە تۆزقاڵێک لە لەتەکەی دیکە، جاری وا بوو بەرز دەبۆوە و جاری واش بوو قوڵەتر، هەتاکوو ئاخری توانی بگا بە قەوارەی ئاسایی خۆی.

لەو کاتەوە هاتبۆوە سەر قەوارەی لەباری خۆی، ماوەیەک تێپەڕی بوو، سەرەتا خۆشی پێی سەیر بوو، بەڵام زۆری پێ نەچوو خووی پێ گرت و وەک جاران دەستی کردەوە بە قسە کردن لەگەڵ خۆی. «دەی! ئێستا نیوەی پلانەکەم جێبەجێ بووە! ئەم گۆڕانانە گێژی کردم! لەوە دڵنیا نیم تاکوو چرکەیەکی دیکە دەبم بە چی؟ هەرچۆنێک بێ، ئێستا کە گەڕاومەتەوە سەر قەوارەی خۆم، کاری دواییم ئەوەیە بەرەو باخە جوانەکە بڕۆم؛ بەڵام ـ چۆن؟» هەر ئەوەی وت، لەپڕدا کەوت بە سەر دەشتێکی بەریندا کە ماڵێکی چکۆلە لە نێوەڕاستەکەی‌دا بوو، نزیکەی میتر و نیوێک بەرز بوو. بیری کردەوە «دانیشتووی ئەم ماڵە هەرکەس بێ، جوان نییە بەم قەڵافەتەوە بچم بۆ لای، لە ترسانا زراوی دەتۆقێ!» دیسان دەستی کردەوە بە گاز لێ‌گرتن لە لەتە کارگەکەی دەستی ڕاستی و نەیوێرا لە ماڵەکە نزیک بێتەوە هەتاکوو باڵای بوو بە بیست و پێنج سانتی‌میتر.

## بەشی شەشەم:
# بەراز و بیبار

یەک دوو دەقە ڕاوەستا و چاوی لە ماڵەکە کرد. خەریکی شەشوبێش کردنی ئەوە بوو کە چی بکا، لە پڕ خزمەتکارێک بە جلوبەرگی خزمەتکارییەوە بە هەڵەداوان لە دارستانەکە هاتە دەرێ ـ (ئالیس بە جلەکانیدا زانی خزمەتکارە، دەنا ئەگەر هەر بە ڕواڵەتیدا بیکوتایە، دەیکوت ماسییە)ـ بە مست تێبەری درگاکە بوو. خزمەتکارێکی دیکە بە جلێکی وەک ئەوەوە درگای کردەوە؛ دەموچاوێکی خڕی هەبوو و چاوە زەقەکانی وەکوو بۆق وا بوو. ئالیس قژی گەردە لێدراوی هەردوو خزمەتکارەکەیدی کە لە سەر سەریان ئاڵقە ئاڵقە بوو. کیژ کەوتە کەوڵی کە بزانێ چ باسە. چەند شەقاوێک لە دارستانەکە هاتە دەرێ و گوێی ڕاگرت.

ماسیی خزمەتکار نامەیەکی گەورەی لە ژێر هەنگڵی دەرهێنا، کە بە قەد خۆی دەبوو. نامەکەی دا بە خزمەتکاری دووهەم و بە ڕاوێژێکی فەرمی پێی وت «هی خاتوونە! شاژن بانگهێشتی کردووە بۆ کایەی کرۆکێت.» بۆقی خزمەتکار، هەر بەو ڕاوێژە فەرمییە، بەڵام بە جێگۆڕکێ بە هێندێک وشە، وتی «هی شاژنە، بۆ کایەی کرۆکێت خانمی بانگهێشت فەرمووە.»

دوایە هەردووکیان کڕنۆشێکی هەتا چۆکیان بۆ یەکتری کرد و ئاڵقەی قژەکانیان تێک گیرا. ئالیس بە دیتنی ئەم دیمەنە ژانی کرد و لە ترسی ئەوەی دەنگی پێکەنینەکەی ببیستن هەڵاتەوە نێو دارستان؛ کاتێک چاوێکی دیکەی لێ کردەوە، دیتی ماسیی خزمەتکار ڕۆیشتبوو و بۆقی خزمەتکار لە سەر عەرز لە پەنای درگاکە دانیشتبوو و بە حاڵەتێکی گەوجانەوە لە ئاسمانی دەڕوانی.




دوایە هەردووکیان کرنۆشێکی هەتا چۆکیان بۆ یەکتری کرد.

ئالیس بە نادڵنیاییيەوە چووە پێش و لە درگای دا.

خزمەتکار وتی «درگا لێدان هیچ کەڵکێکی نییە، لە بەر دوو هۆ. یەکەم، مـن هەر لەو بەرەی درگاکەم کە بۆخۆشت لەوێی؛ دووهەم، ئەوانەی لە ژوورەوەن، کردوویـانەتە بەزمـی خۆیان، پێم وا نییە دەنگی درگـا لێـدانی تـۆ ببیسـتن.» هەر بەڕاسـتیش غەڵبەغەڵبێکـی سەیر و زۆر نائاسایی دەبیسترا: پشمین و شین و شەپۆڕی لە پەستا و جارجارەش دەنگـی ترسێنەری شکانی شتومەک وەکوو ورد بوونی قۆری یان دەوری.

ئالیس وتی «کەوایە تکایە بفەرموون من چۆن بچمە ژوورەوە؟»

«ڕەنگە درگا لێدانی تۆ مانای ببوایە...» خزمەتکار بێ ئەوەی سەرنج بداتە پرسـیاری ئالیس، هەر لە بەر خۆیەوە قسـەی دەکـرد «... ئەگەر ئەم درگـایە لە نێـوانی مـن و تـۆدا بوایە، بۆ نموونە ئەگەر تۆ لە ژوورەوە بوایەی، لە درگات بدایە، من درگام دەکردەوە و تـۆ دەهاتیە دەرێ.» لە کاتی قسە کردندا چـاوی لە ئاسـمان بڕیبـوو. ئـالیس ئەم کـارەی پـێ بێڕێزی بوو بەڵام دوایە بە خۆی وت «ڕەنگە نەتوانێ چاو لە شوێنێکی دیکە بکا، چـونکە چاوەکانی لە نێوەڕاسـتی سـەریدایە، بەڵام خـۆ ئەتـوانێ وەڵام بـداتەوە؟» بە دەنگـی بەرز پرسیارەکەی دووپات کردەوە «چۆن دەتوانم بچمە ژوورەوە؟»

خزمەتکار وتی «من هەتا بەیانی لێرە دادەنیشم ـ»

هەر لەم کاتەدا درگای ماڵەکە کراوە و دەورییەکـی گەورە بە پڕتـاو فـڕێ درایە دەرێ، ڕاست بە پەنای گوێی خزمەتکاردا تێپەڕ بوو، لووتی ڕووشـاند، لە دارێـک کەوت و ورد و خاش بوو.

«ـ ڕەنگە هەتا سبەی ڕۆژیش.» خزمەتکارەکە ڕستەکەی تەواو کرد، بەڵام ڕووداوەکەی هەر بە بای خەیاڵیشدا نەهات.

ئالیس بەرزتر پرسیاری کرد «چۆن بچمە ژوورەوە؟»

خزمەتکار وتی «جا کـێ وتـوویەتی تـۆ دەبـێ بچـیە ژوور؟ لە پـێشدا وەڵامـی ئەوەم بدەوە.»

دیارە حەق بە خزمەتکارەکە بوو، بەڵام ئالیس ئەو قسەی هەر بە دڵ نەبوو و لە ژێر لێوەوە پرتاندی «دەمەقاڵێ لەگەڵ ئەم بوونەوەرانە بەڕاستی گیانکێشانە! پیاو لەوانەیە شێت بێ بە دەستیانەوە!»

خزمەتکار ئەو هەلەی قۆزتەوە و قسەکانی پێشووی بە هێندێک گۆڕانی چکۆلەوە دووپات کردەوە «مَن لێرە دەمێنمەوە، ڕۆژان و ڕۆژان.»

ئالیس وتی «بەڵام ئەمن چی بکەم؟»

خزمەتکار وتی «هەرچی پێت خۆشە بیکە.» دەستی کرد بە فیتوو لێدان.

ئالیس بە ناهومێدییەوە وتی «قسە کردن لەگەڵ ئەمە وەک بایە! حەپۆل مێشخۆر!» دوایە درگای ماڵەوەی کردەوە و چووە ژووری.

درگاکە ڕاستەوخۆ بەرەو ئاشپەزخانەیەکی گەورە دەکراوە کە پڕ بوو لە دووکەڵ. خاتوون ڕاست لە نێوەڕاستی ئاشپەزخانە لەسەر سێ پێچکەیەک دانیشتبوو و منداڵێکی بە باوەشەوە بوو. ئاشپەزەکە دانەویبۆوە سەر وەجاخەکە و مەنجەڵێکی گەورەی دەشێواند کە لەوە دەچوو پڕ بێ لە سووپ.

ئالیس کە پشمین حەجمانی لێ هەڵگرتبوو، بە خۆی وت «ڕەنگە سووپەکەی، زۆری بیبار تێدا بێ.» بە دڵنیاییەوە نێوماڵ پڕ بوو لە بیبار. تەنانەت خاتوونیش جارجارە دەپشمی و منداڵەکەش تاوناتاوێ دەپشمی و دەیزیقاند و ئاراوقارای لێ هەڵگیرابوو. لە نێو ئاشپەزخانەکە تەنیا کەسێک نەدەپشمی، ئاشپەزەکە بوو لەگەڵ پشیلەیەکی گەورە کە لە پاڵ وەجاخەکەدا خەوتبوو و بزە گرتبووی.

ئالیس وڕەی هێنایە بەر خۆی و وتی «ببوورە، دەکرێ بفەرموون...» لەوە دڵنیا نەبوو ئەم قسانە بۆ سەرەتا جوان بوون یان نا، «.. بۆچی پشیلەکەی ئێوە پێدەکەنێ؟»




تەنانەت خاتوونیش جارجارە دەپشمی.

خاتوون وتی «چونکە پشیلەیەکی چێشایرییە[1]. حاڵی بووی؟ بەرازا!»

هێندە بە قین و بوغزەوە وشەی دوایی وت کە ئالیس هەڵبەزییەوە، بەڵام چونکە خێرا زانی کە مەبەستی خاتوون، منداڵەکەیە نەک ئەو، زیاتر ورەی هێنایە بەر خۆی و درێژەی بە قسەکانی دا.

«نەمدەزانی پشیلەی چێشایری پێدەکەنن. ڕاستییەکەی هەر نەمدەزانی پشیلە پێکەنین بزانن.»

خاتوون وتی «هەموویان دەیزانن و زۆربەشیان پێدەکەنن.»

ئالیس کە دیتی قسەیان گەرم کردووە، زۆر بەئەدەبەوە وتی «من هەتا ئێستا هیچ پشیلەیەکم نەدیوە پێبکەنێ.»

خاتوون وتی «تۆ زۆر شتت نەدیوە! قسە لێرەدایە!»

ئالیس ڕاوێژی خاتوونی پێ خۆش نەبوو و بیری کردەوە وا باشە باسەکە بگۆڕێ. بە دوای بابەتێکی نوێدا دەگەڕا کە ئاشپەزەکە مەنجەڵەکەی لە سەر وەجاخەکە لابرد و خێرا هەرچی بە دەستیەوە هات، فڕێی دا بۆ لای خاتوون و منداڵەکە. لە پێشدا مقاشەکان، دوایە بارانەی قابلەمە و دەوری و قاپ. خاتوون بە ڕووی خۆی نەهێنا، تەنانەت کاتێک شتێکیشی لێ دەکەوت؛ ئێستا نەدەکرا بزانی زیقەزیقی لە بەر هێشی ئەو شتانەیە یان نا، چونکە منداڵەکە پێشتریش دەیزیقاند.

«ئۆۆۆی! تکایە زیاتر سەرنج بدە!» ئالیس لە ترسا هەڵبەز و دابەزی بوو و هاواری دەکرد «ئۆی! لە لووتە قنجەکەی کەوت!» قابلەمەیەکی یەکجار زەلام، ئەونەدە لە پەنای لووتی منداڵەکەوە ویژەی هات کە هێندەی نەمابوو هەڵیکەنێ.

خاتوون بە دەنگی نووساوەوە پرتاندی «ئەگەر هەرکەسێک سەرقاڵی کاری خۆی بوایە، چەرخی گەردوون لەوە خێراتر دەگەڕا.»

---

[1] خەڵکی چێشایر (Cheshire) ناوچەیەکە لە ئینگلیس.

«هیچ قازانجێکیشی نەبووا» ئالیس زۆر خۆشحاڵ بوو ئەم دەرفەتەی بۆ ڕەخسابوو کە زانیارییەکانی بە چاوی کەسێکدا بداتەوە. «بیری لێ بکەنەوەا چ بەڵایەک بە سەر ڕۆژ و شەودا دەهات؟ حەتمەن دەزانی کە زەوی بە هەر بیست و چوار سەعات، جارێک بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، کاتێک سەر لە کەل دەردێنێ هەتا ڕۆژهەڵاتێکی دیکە...»

خاتوون وتی «باسی سەر کرا، سەری بپەڕێنن!»

ئالیس بە نیگەرانییەوە چاوی لە ئاشپەز کرد بزانێ بەتەمایە فەرمانی خاتوون بەڕێوە ببا یان نا. بەڵام ئاشپەز تەواو سەرقاڵی شێواندنی سووپ بوو و وا دیار بوو هۆشی لەوێ نەبوو. ئالیس چشێکی لێ کرد و درێژەی بە قسەکانی دا «بیست و چوار سەعات دەخایەنێ ... پێموایە ... یان دوازدە سەعات؟ من ...»

خاتوون وتی «لە کۆڵم بەوەا تاقەتی ژمارە و پێوانەم نییە.» خەریکی پەڕۆ گۆڕینی منداڵەکە بوو. لایەلایەی بۆ دەخوێندەوە و لە کۆتایی هەر دێڕێکدا بە توندی هەڵیدەخستەوە.

"قەت قەت ڕوو مەدە بە منداڵەکەت
کاتێ کە پشمی، بیکوتە بە تێڵا
پێی مەڵێ: پشمیت، خێر بێتە سەر ڕێت
شک مەخە دڵت، کە سەبری هێناا"

**کۆڕخوێنەکان**

(ئاشپەز و منداڵ پێکەوە)

زیقا زیقا زیقا

خاتوون دەستی کرد بە خوێندنەوەی بەشی دووهەمی لایەلایەکە و دیسان هێندە بە توندی منداڵەکەی هەڵدەخستەوە و ئەو بەستەزمانە هێندە سەیر دەگریا کە ئالیس بە زەحمەت وشەکانی لایەلایەکەی دەبیست.

"قەت قەت ڕوو نادەم بە منداڵەکەم
بە مست لێی دەدەم، لە کاتی پشمین
چونکە دەزانم، لە گەردی بیبار
کەڵک وەردەگرێ، بۆ ئازار و قین!"

## کۆڕخوێنەکان

زیق! زیق! زیق!

«بیگرە! ئەگەر پێت خۆشە، لە باوەشی بکە!» خاتوون هەر ئەمەی وت، منداڵەکەی حەوا دا بۆ ئالیس. «من دەبێ بچم خۆم ساز بکەم بۆ کایەی کرۆکێت لەگەڵ شاژن.» بەپەلە لە ئاشپەزخانە چووە دەرێ. ئاشپەز تاوەیەکی بە دوادا حەوا دا کە ڕاست بە پەنا گوێی خاتووندا تێپەڕی.

ئالیس بە زەحمەت منداڵەکەی گرتەوە، چونکە ئەو بوونەوەرە چکۆلەیە قەڵافەتێکی سەیری هەبوو و لە پەستا دەست و لاقی بۆ هەموو لایەک دەبرد. ئالیس بیری کردەوە «وەک ئەستێرەی دەریایی!» بەستەزمانە وەکوو ماشێنی هەڵمی دەیفیشکاند و خۆی دەکێشاوە و بە کورتی لە سەرەتاوە هەتاکوو یەک دوو دەقە، تەنیا کارێک ئالیس توانی بیکا ئەوە بوو نەهێڵێ منداڵەکە لە دەستی بەربێتەوە.

هەرکە ڕێگای دروست لە باوەش گرتنی منداڵەکەی زانی، (منداڵەکەی گرێ دا و گوێی ڕاست و لاقی چەپی بە توندی گرت کە خۆی نەکاتەوە) لە ماڵەوە بردیە دەرێ و بیری کردەوە «ئەگەر لەگەڵ خۆم نەیبەم، ئەمانە حەتمەن بە دوو ڕۆژ گیانی دەکێشن! بە تەنیا جێی بهێڵم، تاوان نییە؟» بە دەنگی بەرز ڕستەی دوایی وت و منداڵەکە لە وەڵامدا مرخاندی (ئێستاکە ئیتر نەدەپشمی). ئالیس وتی «مرخەمرخ مەکە! حەول بدە جوان قسە بکەی!»

منداڵەکە دیسان مرخاندی و ئالیس بە دڵەڕاوکێوە سەری بردە لای دەموچاوی، بزانێ چی بووە. هیچ شکی تێدا نەبوو کە لووتی منداڵەکە لە هی ئاسایی قنجتر بوو. زۆرتر لە

قەپۆز دەچوو هەتا لە لووت. چاویشی زۆر چکۆلەتر لە چاوی منداڵێک بوو. لەسەریەک، ئالیس قەڵافەتی ئەم منداڵەی نەچووە دڵەوە. «بەڵام ڕەنگە زۆر گریابێ.» دیسان چاوی لە چاوەکانی منداڵەکە کردەوە بزانێ فرمێسکاوییە یان نا.

نا، فرمێسکی پێوە دیار نەبوو. «دڵەکەم، ئەگەر بڕیار وایە ببی بە بەراز،» ڕاوێژی ئالیس تەواو جیددی بوو «ئیدی من کارم پێت نەداوە، ئاگادار بە!» ئەو بوونەوەرە بەستەزمانە دیسان کەوتەوە گریان (یا مرخەمرخ، نەدەکرا بڵێی کامەیانە)، ماوەیەک هەر بەم شێوەیە ڕابرد.

ئالیس بیری کردەوە «دەی، کاتێ گەیشتمەوە ماڵێ، چی بکەم لەم دەعبایە؟» دیسانەکە مرخەمرخ دەستی پێکردەوە، ئەوندە زۆر بوو کە ئالیس بە دڵەڕاوکێوە تەماشای دەموچاوی منداڵەکەی کرد. ئیدی هیچ شکێکی تێدا نەبوو. بوونەوەرە چکۆلەکە تەواو چۆخەبازەڵەیەک بوو و ئالیس بیری کردەوە لە باوەش گرتن و هەڵگرتنەکەی کارێکی گەوجانەیە.

لە سەر عەرزی دانا و کاتێک دیتی لە نێو دارستاندا خلۆر بۆوە و وەڕێکەوت، ئیدی دڵی حەساوە. «ئەگەر گەورە بوایە،» ئالیس قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد «منداڵێکی زۆر دزێوی لێ دەردەچوو، بەڵام پێموابێ ئێستاکە بەرازێکی کەمێک ژیکەڵە بێ.» ئەو منداڵانەی وەبیر هاتەوە کە زۆر بە باشی دەکرا بە جێگای بەرازیان دابنێی. خەریک بوو لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد «بەڵام ئەگەر بنیادەم ڕێگای گۆڕینیانی بزانیبایە ...» لەپڕ هەڵبەزیەوە: پشیلەی چێشایری لە سەر لقی دارێک، چەند میترێک لەولاترەوە تووتەی کردبوو.



*دیتی لە نێو دارستاندا خلۆر بۆوە و وەڕێکەوت.*

کاتێک پشیلەکە ئالیسی دیت تەنیا پێکەنی و هەرچەندە بە ڕواڵەت لە ڕووخۆش دەچوو، بەڵام پەنجەی زۆر بەرزی هەبوو و ددانەکانیشی زۆر تیژ بوون، ئالیس زانی کە دەبێ هەڵس‌وکەوتەکەی زۆر بە ڕێزەوە بێ.

بە پارێزەوە دەستی پێ‌کرد «پشە چێشایری!» دڵنیاش نەبوو پشیلە ئەم ناوەی پێ خۆش بێ. کاتێ پێکەنینی پشیلەکە پان‌تر بوو، ئالیس بیری کردەوە «دەی، هەتا ئێرەی بە نابەدڵ نەبووە!» درێژەی بە قسەکانی دا «دەکرێ پێم بڵێی لە کوێوە بڕۆم؟»

پشیلە وتی «دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟»

ئالیس وتی «کوێیەکەی زۆر گرینگ نییە...»

پشیلە وتی «کەوایە لایەکەشی گرینگ نییە ...»

ئالیس بۆ ڕوونکردنەوە وتی «هەر دەمەوێ بگەم بە شوێنێک.»

پشیلە وتی «وەڕێ‌بکەوە، حەتمەن بە شوێنێک دەگەی.»

ئالیس بیری کردەوە پشیلەکە ڕاست دەکا و پرسیارێکی دیکەی کرد «لەم لایانە چ خەڵکانێک دەژین؟»

«لەم لایە،» پشیلە بە پەنجەی ڕاستی لایەکی نیشان دا، «کڵاودرووییەک دەژی. لەو لایە،» بە پەنجەکەی دیکەی ئاماژەی کرد «کەروێشکی خاکەلێوەیی. بۆ لای هەرکامێکیانت پێ‌خۆشە، بچۆ. هەردووکیان شێتن.»

ئالیس وتی «بەڵام پێم خۆش نییە بچم بۆ لای شێت.»

پشیلە وتی «چارەیەکت نییە. لێرە هەموو شێتن. من شێتم. تۆ شێتی.»

ئالیس وتی «لە کوێوە دەزانی من شێتم؟»

پشیلە وتی «حەتمەنە هەی. ئەگەر نەبوایەی نەدەهاتی بۆ ئێرە.»

ئالیس قنیاتی نەهێنابوو، بەڵام هەرچۆنێک بێ درێژەی بە قسەکانی دا «لە کوێوە دەزانی خۆت شێتی؟»

پشیلە وتی «یەکەم لە بەر ئەوەی سەگ شێت نییە، وایە؟»

ئالیس وتی «پێم وا بێ.»

پشیلە درێژەی بە قسەکەی دا «دەیجا چاو لێکە، سەگ کاتێک توورە دەبێ، حەپەحەپ دەکا و کاتێکیش کە خۆشحاڵە، کلکەسووتێ دەکا؛ بەڵام من کاتێک کە خۆشحاڵم حەوحەو دەکەم، کاتێکیش کە توورەم، کلکم هەڵدەسوورێنم، کەوایە من شێتم.»

ئالیس وتی «ناوەکەی میاوەمیاوە، نەک حەوحەو.»

پشیلە وتی «هەر ناوێکی لێی دەنێی کەیفی خۆتە. تۆ ئەمڕۆ لەگەڵ شاژن کرۆکێت دەکەی؟»

ئالیس وتی «زۆرم پێ خۆشە، بەڵام هێشتا بانگهێشت نەکراوم.»

پشیلە وتی «ئەوێش دەبینین.» دوایە لە چاوان ون بوو.

ئالیس زۆری پێ سەیر نەبوو. خەریک بوو خووی بەم ڕووداوە سەیرانە دەگرت. هێشتا هەر چاوی لەو شوێنە بوو کە پێشتر پشیلەکەی لێ بوو، کە لە پڕ پشیلەکە وەدیار کەوتەوە.

«ئەرێ بەڕاست، منداڵەکە چی لێ هات؟ خەریک بوو لە بیرم بچێ لێت بپرسم.»

ئالیس زۆر ئاسایی وەڵامی داوە «بوو بە بەراز.» دەتکوت گەڕانەوەی پشیلەکە هەر سەیر نەبووە.

پشیلەکە وتی «دەمزانی.» دیسانەکە ون بۆوە.

ئالیس سەبرێکی گرت. کەمتاکورتێ چاوەڕێ بوو هەتا پشیلەکە وەدیار کەوێتەوە، بەڵام هیچ باسێک نەبوو و پاش یەک دوو دەقە لەو شوێنەوە کە پشیلەکە وتبووی بەرەو ماڵی کەروێشکی خاکەلێوەیی وەڕێ‌کەوت. بە خۆی وت «پێشتر کڵاودرووم دیوە. دەبێ کەروێشکی خاکەلێوەیی زۆر سەیرتر بێ، ئێستاش کە مانگی بانەمەڕە، ڕەنگە زۆر شێت نەبێ ... لانی‌کەم بە قەد مانگی خاکەلێوە.» ئەمەی وت و چاوێکی لە سەرێ کرد و دیسان پشیلەکەی دیتەوە کە لە سەر لقی دارێک تووتەی کردووە.

پشیلە پرسیی «وتت بەراز یان بەزاز؟»

ئالیس وەڵامی داوە «بەراز! بریا تۆ ئەوندە لە پڕتاودا ون و دیار نەدەبووی، پیاو سەری لە گێژەوە دێ.»

پشیلە وتی «بە چاوان.» ئەمجارەیان بە هێمنی ون بوو. لە نووکی کلکیەوە دەستی پێ کرد و گەیشت بە پێکەنینەکە کە هەتا ماوەیەک دوای ونبوونەکە جێگاکانی دیکەی هەر وا دیار بوون.

«دەیجا خۆ پشیلەی بێ پێکەنینم زۆر جار دیتبوو.» ئالیس بیری دەکردەوە «بەڵام پێکەنینی بێ پشیلە! ئەمە ئیتر سەیرترین شتە کە بە عومراتم دیتوومە.»

ڕێگایەکی زۆری نەبڕیبوو کە گەیشتە ماڵی کەروێشکی خاکەلێوەیی. بەوەدا وتی ماڵی کەروێشکە، چونکە دووکەڵکێشەکانی لە گوێچکە دەچوون و سەربانەکەی لە تووک بوو. ماڵەکە هێندە گەورە بوو کە هەتاکوو لەتێکی لە کارگی دەستی چەپ نەخوارد و بەژنوباڵای ڕێک هەڵنەچوو و نەگەیشتە نزیکەی شەست سانتیمیتر، نەیوێرا لێی نزیک بێتەوە. تەنانەت لەم دۆخەشدا زۆر بە ناخاترجەمییەوە بەرەو ماڵەکە وەڕێکەوت و بە خۆی وت «جا وەرە سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئێستاش هەر شێتوشوور بێت! بریا بە جێی ئێرە، بچووبایەم بۆ ماڵی کڵاودروو.»




پشیلەکە ئەمجارەیان بە هێمنی ون بوو.

# بەشی حەوتەم
# میوانی تیکەولیکە

لە ژێر دارێکی بەر ماڵەکەدا مێزێک چنرابوو و کەروێشکی خاکەلێوەیی و کڵاودروو خەریکی خواردنی عەسرۆژە بوون. لە نێوانیاندا جرجەمشکێکی زستانەخەو دانیشتبوو کە لە حەوت ساڵان ڕاست ببۆوە. کەروێشک و کڵاودروو، مشکەکەیان کردبوو بە باڵنج. شانیان دەدا سەری و لە سەر ئەوەوە قسەیان لەگەڵ یەک دەکرد. ئالیس بیری کردەوە «دەبێ مشکەکە زۆر نارەحەت بێ، بەڵام پێم وایە چونکە لە خەودایە، بە بای خەیاڵیدا نایە.»

مێزەکە گەورە بوو، بەڵام هەرسێکیان لە گۆشەیەکیدا کۆ ببوونەوە، هەرکە ئالیسیان دیت، قیژاندیان «جێ نییە! جێ نییە!» ئالیس بە ڕووگرژییەوە وتی «ئەو هەمووە جێگایە!» لە لایەکی دیکەی مێزەکە لە سەر ئەسکەملێکی دەسکەداری گەورە دانیشت.

کەوروێشک خوڵکی کرد «فەرموو شەراب بخۆوە.»

ئالیس چاوێکی بە مێزەکەدا گێڕا بەڵام بێجگە لە چایی هیچی دیکەی نەدی. «خۆ ئێرە شەرابی لێ نییە.»

کەروێشک وتی «بەڵێ، لێی نییە.»

ئالیس تووڕە بوو «کەوایە خوڵک کردنەکەی تۆ لە ئەدەبەوە دوورە.»

کەروێشک وتی «ئەگەر بەبێ بانگهێشتن لە سەر مێزی ئێمە دانیشی، لە ئەدەبەوە دوور نییە؟»

ئالیس وتی «نەمدەزانی مێز، مێزی ئێوەیە. بۆ زیاتر لە سێ کەس ڕازاوەتەوە.»

«دەبێ قژت قوڵە بکەیتەوە.» کڵاودروو ماوەیەک بە سەرنجەوە لە سەرتاپای ئالیسی ڕوانی و ئەمە یەکەمین ڕستەی بوو.

ئالیس بە شێوەیەکی جیددی وتی «دەبێ فێر بی کارت بە کاروباری تایبەتی خەڵک نەبێ! ئەم کارە بێڕێزییە.»

کڵاودروو بە بیستنی ئەم قسەیە چاوی دەرپەڕاند بەڵام تەنیا شتێک کە وتی ئەمە بوو «دەزانی قشقەرە و مێزی نووسین لە چیدا لە یەک دەچن؟»

ئالیس لە دڵی خۆیدا وتی «زۆر باشە! ئێستا تەواو ڕایدەبوێرین. زۆر باش بوو مەتەڵیان داهێنا.» بە دەنگی بەرز وتی «پێموابێ وەڵامەکەی دەزانم.»

کەروێشک وتی «مەبەستت ئەوەیە کە پێتوایە دەتوانی وەڵامەکەی ببینیەوە؟»

ئالیس وتی «مەبەستم ڕاست ئەمە بوو.»

کەروێشک درێژەی بە قسەکەی دا! «کەوایە دەبێ بتوانی مەبەستەکەت بڵێی.»

ئالیس بە پەشۆکاوی وتی «دەتوانم. مەبەستم ئەوە بوو کە پێموایە ... یان پێموایە کە مەبەستم ئەوە بوو ... هەرچۆنێک بێ چ جیاوازییەکی هەیە؟ هەردووکیان هەر یەکن!»

کڵاودروو وتی «کوێیان یەکە؟ وەک ئەوە وایە بڵێی "ئەو شتەی دەیخۆم دەیبینم" لەگەڵ "ئەو شتەی دەیبینم دەیخۆم" جیاوازی نییە!»

کەروێشک وتی «یان وەک ئەوە وایە بڵێی "هەرچی بێتە پێشم، پێم خۆشە" لەگەڵ "هەرچی پێم خۆشە، دێتە پێشم" جیاوازی نییە.»

جرجەمشکی زستانەخەو کە دەتکوت بڵمەبڵم دەکا وتی «یان وەک ئەوە وایە بڵێی "کاتێک کە هەناسە دەکێشم لە خەودام" لەگەڵ "کاتێک کە لە خەودام هەناسە دەکێشم" جیاوازی نییە.»

کڵاودروو بە مشکی وت «سەبارەت بە تۆ هیچ جیاوازییەکی نییە.» لێرەدا قسەکان تەواو بوون و بێدەنگی باڵی بە سەریاندا کێشا کە ئالیسیش حەولی دا هەرچی سەبارەت بە قشقەرە و مێزی نووسین دەیزانێ، وەبیری بێنێتەوە بەڵام هێندە بەرچاو نەبوو.

یەکەم کەس کە بێدەنگی شکاند، کڵاودروو بوو کە ڕووی لە ئالیس کرد «ئەمڕۆ چەندەی مانگە؟» سەعاتەکەی لە گیرفانی دەرهێنابوو و بە نارەحەتییەوە چاوی لێ دەکرد. جارجارەش ڕایدەوەشاند و بە گوێیەوە دەنا.

ئالیس بڕێک بیری کردەوە، دوایە وەڵامی داوە «چوار.»

کڵاودروو ئاخێکی هەڵکێشا. «دیسان دوو ڕۆژ ئەملا و ئەولای کردووە!» بە تووڕەییەوە لە کەروێشکی ڕوانی. «پێم وتی کەرە چاری ناکا!»

کەروێشک سەری داخستبوو، وتی «بەڵام کەرەکەی یەکاویەک بوو!»

کڵاودروو بۆڵاندی «بەڵێ، بەڵام حەتمەن ورکەنانیشی تێکەڵ بووە. نەدەبوو چەقۆی نانبڕت بە کار بهێنایە.»

کەروێشک سەعاتەکەی هەڵگرت و بە نارەحەتییەوە لێی ڕوانی. دوایە خستییە نێو پەرداخی چایەکەوە، دەریهێناوە و چاوی لێ کردەوە. بەڵام بێجگە لەو ڕستەیەی سەرەتا، هیچی دیکەی بە مێشک نەگەیشت «کەرەکەی یەکاویەک بوو.»

ئالیس کە لە سەرووی شانی کەروێشکەوە بە سەرنجەوە چاوی لێ دەکرد وتی «لەو سەعاتە سەیرە! بە جێی کات، ڕۆژ نیشان دەدا.»

کڵاودروو لە ژێر لێوەوە بە پرتەوە وتی «دەیجا چییە؟ مەگەر سەعاتەکەی خۆت، ساڵ نیشان نادا؟»



*دوایە خستییە نێو پەرداخی چایەکەوە*

ئالیس بێڕاوەستان وەڵامی داوە «جا دیارە نیشانی نادا، دەنا میلەکان بەساڵێک نەدەجووڵانەوە.»

کڵاودروو وتی «گرفتەکەی منیش ڕاست ئەوەیە.»

ئالیس گێژ ببوو. ئەگەرچی بە دڵنیاییەوە هەردووکیان بە زمانێک قسەیان دەکرد، بەڵام قسەی کڵاودرووی بە بێمانا دەهاتە بەرچاو. تەواوی حەولی خۆی دا هەتا بەئەدەب بێ، وتی «جوان حاڵی نەبووم.»

کڵاودروو وتی «مشکە دیسان خەو بردیەوە.» کەمێکی چایی گەرم کردە سەر لووتی مشکەکە.

مشکە خێرا خێرا سەری ڕاتەکاند و بێ ئەوەی چاو هەڵبێنێ وتی «هەڵبەت، هەڵبەت، منیش دەمویست هەر ئەوە بڵێم.»

کڵاودروو دیسان ڕووی لە ئالیس کرد: «وەڵامی مەتەڵەکەت دیتەوە؟»

ئالیس وتی «نا، ئەقڵم بڕ ناکا. وەڵامەکەی چییە؟»

کڵاودروو وتی «هەر نایزانم.»

کەروێشک وتی «منیش هەروا.»

ئالیس وەڕەز و ماندوو ئاخێکی هەڵکێشا. «لە جیاتی کات بە فیرۆدان بەم مەتەڵە بێوەڵامانەوە، وا باشتر نییە بەهرەیەکی باشتری لێ وەربگرن؟»

کڵاودروو وتی «ئەگەر تۆ وەک من، کاتت بناسیبایە، باسی بە فیڕۆ چوونی ئەوت نەدەکرد. کات ئەوە.»

ئالیس وتی «لێت حاڵی نیم.»

کڵاودروو سەری بەرز کردەوە و بە سووکایەتییەوە وتی «جا دیارە کە حاڵی نابی. گرێو دەکەم هەتا ئێستاکە لەگەڵ کات قسەت نەکردووە!»

«ڕەنگە،» ئالیس بە پارێزەوە وەڵامی داوە، «بەڵام لە سەر پۆلی مووسیقا دەبێ بە کات زەرب ڕابگرم.»

«ئەهها! باسەکە ڕوون بۆوە. کات هێزی زەربە لێدانی نییە. بەڵام ئەگەر بە جوانی لەگەڵی بجووڵێیتەوە، هەرکارێک سەبارەت بە سەعات پێت خۆش بێ بۆت دەکا. بۆ نموونە وای دانێ سەعات نۆی بەیانییە، ڕاست کاتی دەس پێکردنی دەرسە. هەر ئەوندە بە گوێی کاتدا بچرپێنی، لە چاوتروکانێکدا میلەکان دەسوورێن و سەعات دەبێتە یەک و نیو! کاتی نەهارا!»

(کەروێشک ورتەورتی بوو «بریا ئێستا بوایە.»)

ئالیس کەوتە بیرەوە، دوایە وتی «خۆ ئەمە زۆر باشە، بەڵام ... بەڵام خۆ هێشتا برسیم نییە.»

کڵاودروو وتی «ڕەنگە لە سەرەتاوە وا بێ... بەڵام دەتوانی هەتا هەر کاتێک پێت خۆشبوو، میلەکان لە سەر یەک و نیو ڕاگری.»

ئالیس پرسیی «خۆت ئەو کارەت کردووە؟»

کڵاودروو بە خەمەوە سەری لەقاند «من نەمکردووە. دەزانی، خاکەلێوەی ساڵی پار، بوو بە شەڕمان... ڕاست بەر لە شێت بوونی ئەو .. (بە کەوچکی چایخۆری ئاماژەی بە

کەروێشکی خاکەلێوەیی کرد.) لە کۆڕێکی گۆرانی و مووسیقادا بووین کە شاژنی دڵ ڕێکی خستبوو، و من دەبوو ئەم شێعرەم بخوێندبایەتەوە:

"چەکچەکیلە! چاو داگرە، چاو داگرە

پێم سەیرە بۆچی گیانت دەڵێی ئاگرە!"

ڕەنگە شێعرەکەییت بیستبێ؟»

ئالیس وتی «پێموایە شتێکی وام بیستووە.»

کڵاودروو وتی «پاشماوەکەی ئاوایە:

هەڵبفڕی، بچیە پەڕپەڕۆچکەی ئاسمان

وێنەی کەشەفی چایی، بەبێ ئیستیکان!

چاو داگرە! چاو داگرە!»

هەرکە گەیشتە ئێرە، مشکەکە جووڵاوە و لە خەودا دەستی کرد بە گۆرانی وتن «چاو داگرە، چاو داگرە، چاو داگرە ...» ئەوندەی دووپات کردەوە کە کەروێشک و کڵاودروو نقورچکیان لێ گرت جا بێدنگ بوو.

کڵاودروو وتی «بەڵێ، هێشتا دێڕی یەکەمم تەواو نەکردبوو کە شاژنی دڵ هەڵبەزییەوە وتی "خەریکە کات بە فیڕۆ دەدا! سەری بپەڕێنن!"»

ئالیس بە هەیەجانەوە وتی «لەو دڕندەییە!»

کڵاودروو هێشتا هەر نارەحەت بوو «لەوساوە، کات هیچ کارێکم بۆ ناکا! ئێستاکە هەمیشە، کات شەشی ئێوارەیە.»

ئالیس لەپڕدا بە شتێکی گرینگ گەیشت. پرسیی «بۆیە لەم سەر مێزە ئەو هەموو پەرداخ و ئیستیکانە هەیە؟»

کڵاودروو ئاخێکی هەڵکێشا «بەڵێ، لەبەر ئەوەیە. ئێستاکە هەمیشە کاتی عەسرۆژەیە و دەرفەتی قاپ شتنمان نییە.»

ئالیس وتی «کەوایە پێموابێ ئێوە بە دەوری مێزەکەدا دەسووڕێنەوە؟»

کڵاودروو وتی «ڕاست وایە! هەرخێرا دوای ئەوەی قاپەکان پیس بوون!»

ئالیس چشی لێ کرد و پرسیی «ئەی ئەگەر گەیشتنەوە سەر جێگای هەوەڵتان، چ دەکەن؟»

کەروێشک بە باوێشکەوە قسەکەی بڕی و وتی «چۆنە باسەکە بگۆڕین؟ خەریکە وەڕەز دەبم. پێشنیاری من ئەوەیە ئەو کچۆڵە **هەقایەت**مان بۆ بگێڕێتەوە.»

ئالیس کە لەم پێشنیارە هەڵبەزیبۆوە، وتی «بە داخەوە من **هەقایەت** نازانم.»

کەروێشک و کڵاودروو پێکەوە هاواریان کرد «کەوایە دەبێ جرجەمشک بیگێڕێتەوە! هەستە جرجە چرچە!» هەرخێرا لە دوو لاوە نقورچکیان لە مشک گرت.

مشک بە ئارامی چاوی هەڵێنا. «من نەخەوتبووم.» دەنگی نووساو و لاواز بوو. «ئەوەی وتتان، سەرپاکیم بیست.»

کەروێشک وتی «هەقایەت بگێڕەوە!»

ئالیسیش تکای کرد «بەڵێ، تکایە بیگێڕەوە!»

کڵاودروو ئەوەشی وت «خێراش بیڵێ، دەنا ئێستا دەستت پێنەکردووە، خەو دەتباتەوە.»

مشک بە پەلە دەستی پێکرد «یەکێک هەبوو، یەکێک نەبوو، سێ خوشک هەبوون بە ناوی ئێلسی و لەیسی و تیلی[1]، کە لە نێو چاڵێکدا دەژیان ...»

---

[1] Elsie – Lacie - Tillie



لە نێو چاڵێکدا دەژیان.

ئالیس کە هەمیشە پێی خۆش بوو باسی خواردەمەنی بکا، پرسی «چییان دەخوارد؟»

جرجەمشکە یەک دوو دەقە بیری کردەوە. دوایە وتی «تلّتەی چەوەندەر!»

ئالیس بە هێواشی وتی «شتی وا نابێ! چونکە نەخۆش دەکەوتن!»

جرجەمشکە وتی «کەوایە نەخۆش کەوتن. زۆر نەخۆش بوون.»

ئالیس حەولی دا ئەم شێوازە نائاساییەی ژیان بێنێتە مێشکی خۆی بەلاّم ئەوندەی پێ سەیر بوو کە دەستی لێ شتەوە و پرسیی «بەلاّم بۆچی لە نێو چاڵێکدا دەژیان؟»

کەروێشک داوای لە ئالیس کرد «دیسان چای بخۆوە! زۆرتر بخۆوە!»

«خۆ مـن هێشـتا هـیچم نەخـواردۆتەوە!» ئـالیس قەڵـس بـوو «کەوایە نـاتوانم زۆرتـر بخۆمەوە.»

کلاّودروو وتی «مەبەستت ئەوە بوو کە ناتوانی کەمتـر بخـۆیەوە! کـاری تـۆ هەر بـۆتە زۆرتر خواردن!»

ئالیس وتی «کەس نەیکوت بیرورای تۆ چییە!»

کلاّودروو وەک سەرکەوتوویەک وتی «جا ئێستاکە کێ بیرورای تایبەتی دەربڕی؟»

ئالیس کە وەلاّمی ئەمەیانی پێ نەبوو، چەند لەتە نـان و کەرەی بە چـایەکەوە خـوارد، دوایە ڕووی لە مشـکەکە کـرد و پرسـیارەکەی دووپـات کـردەوە «بـۆ لە نێـو چـاڵەکەدا دەژیان؟»

مشک دیسان بەر لە وەلاّم دانەوە، کەوتەوە بیـر کـردنەوە. دوایە وتـی «چـونکە چـاڵی تلّتە بوو.»

«شتی وا هەر نابێ و نەبووە!» ئالیس خەریک بوو بە تەواوی قەڵس دەبوو کە کلاّودروو و کەروێشک پەڕینە نێو قسەکانی «وست! وست!» مشـکەش بە قەڵسـییەوە وتـی «ئەگەر ناتەوێ بەئەدەب بی، بۆخۆت پاشماوەی هەقایەتەکە بگێڕەوە!»

ئالیس خۆی کۆ کردەوە و وتی «نا، تکات لێ دەکەم بیگێڕەوە! دەی ڕەنگە چـاڵێکی وا هەبێ.»

مشکە بە وەڕەزییەوە وتی «هەر دانەیەکا وەڵڵا ڕاستا!» بەڵام هەرچۆنێک بوو ڕازی بوو بیگێڕێتەوە «بەم شێوەیە ئەم سێ خوشکە چکۆلەیە فێری وێنە کێشانەوە دەبوون و ...»

«چییان دەکێشاوە؟» ئالیس بەڵێنییەکەی بە تەواوی لە بیر چووبۆوە.

مشکە ئەمجارە بێ‌ڕاوەستان وەڵامی داوە «تڵتەی چەوەندەر!»

کڵاودروو پەڕییە نێو هەقایەتەکە «مـن پەرداخێکـی خاوێنم دەوێ. هەرکەسەو بۆ کورسییەک پێش‌ترا!»

بۆخۆی کورسییەک چووە پێش‌تر، مشکە لە جێی کڵاودروو دانیشت، کەروێشک لە جێی مشک و ئالیسیش بە ناچاری لە جێی پێشووی کەروێشک دانیشت. کڵاودروو تەنیا کەسێک بوو کە لەم گۆڕانە قازانجی کرد و بارودۆخی ئالیس خراپتر لە جاران کەوتە چونکە هەرڕاست ماوەیەک پێش‌تر کەروێشک پارچە شیرەکەی قڵپ کردبۆوە نێو دەورییەکەی خۆی.

ئالیس کە نەیدەویست دیسان مشکە بڕەنجێنێ، ئەمجارەیان بە پارێزێکی تەواوەوە دەستی پێ‌کردەوە «بەڵام سەر دەرنابەم، چۆنیان تڵتە دەکێشا...؟»

کڵاودروو وتی «ئەگەر بکرێ لە بیری ئاو، ئاو بکێشی، دەشکرێ لە چاڵی تڵتە، تڵتە بکێشی. تێگەیشتی گەوجە!»

ئالیس گوێی لە دوایین وشەی کڵاودروو خەواند و وتی «بەڵام خۆ تۆ وتت ئەوان لە نێو چاڵەکەدا بوون، واتە لە تەرکی چاڵەکەدا بون.»

مشک وتی «دیارە، دەیانویست سەر لە نێو چاڵەکە دەربێنن.»

ئالیسی بەستەزمان لەم وەڵامە هێندە سەری سووڕما کە هەتا ماوەیەک بێدەنگ دانیشت و لێگەڕا مشکە هەقایەتەکەی بگێڕێتەوە.

«بەڵێ، فێری وێنەکێشان دەبوون.» مشکە باوێشکی دەدا و چاوی هەڵدەگلۆفی چونکە تەواو خەو دایگرتبوو. «هەموو شتێکیان دەکێشاوە .. هەرشتێک کە بە "هـ" دەستی پێ بکردایە.»

ئالیس وتی «بۆچی بە "هـ"؟»

کەروێشک وتی «جا بۆ بەو نەبێ؟»

ئالیس بێدەنگ بوو.

مشکەکە ئێستاکە چاوی قووچاندبوو و سەرخەوێکی دەشکاند. بەڵام بە نقورچکی کڵاودروو قیژاندی و لە خەو ڕاپەڕی و درێژەی پێدا «.. کە بە "هـ" دەستی پێدەکرد، وەکوو هێلنج، هەسارە، هیوا، هاوشێوە... حەتمەن بیستووتە دەڵێن ئەوە هاوشێوەی ئەمەیە ... تاکوو ئێستا شێوەکاری هاوشێوەت دیوە؟»

ئالیس کە بە تەواوی گێژ ببوو وتی «تۆ لە من دەپرسی؟ چاوکە! پێموانییە قەت...»

کڵاودروو وتی «کەوایە قسە مەکە!»

ئالیس ئیدی لەم ڕووهەڵماڵدراوییە لە دین چووبووە دەرێ. بە دڵێکی پڕ لە قینەوە هەستا و وەڕێکەوت. مشکە خێرا خەو بردیەوە و دووانەکەی دیکە هەر گوێشیان نەدا بە ڕۆیشتنەکەی؛ ئەگەرچی ئالیس چەند جار ئاوڕی داوە و نیوەهیوایەکی هەبوو هەرای لێ بکەنەوە. دوایین جار کە ئەوانی دیت، خەریک بوون مشکەکەیان دەخستە نێو چادانەکەوە.

«قەتم پێ خۆش نییە بگەڕێمەوە ئەوێ.» لە نێو دارستاندا بە دوای ڕێگادا دەگەڕا و لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد «ئەمە قۆڕترین میوانیی عەسرۆژە بوو کە بە عومراتم چووبێتم.»

هەرکە ئەمەی وت، دیتی یەکێک لە دارەکان درگایەکی هەیە کە ڕێکوڕاست بۆ نێو دارەکە دەکراوە. بە خۆی وت «چ شتێکی سەیرە! بەڵام ئەمڕۆ هیچ شتێک سەیر نییە! پێموایە وا باشە هەر خێرا بچمە ژووری.» چوو.

جارێکی دیکە هاتبۆوە نێو تالاری گەورە و لە پاڵ مێزێکی چکۆلەی شووشەیی ڕاوەستابوو. بە خۆی وت «ئەم جارە دەرەقەتی دێم!» لە پێشدا کلیلە چکۆلە زێڕەکەی هەڵگرت و ئەو درگایەی بەرەو باخ دەچوو کردیەوە، دوایە دەستی کرد بە گاز گرتن لە کارگەکە (لەتێکی لە گیرفانیدا ڕاگرتبوو) هەتا باڵای گەیاندە نزیکەی سی سانتیمیتر: دوایە لە ڕێڕەوە چکۆلەوە تێپەڕی و پاشان ... ئاخری گەیشتە باخە جوانەکە و نێو باخچە پڕ گوڵ و فیشقاوە فێنکەکان.

## بەشی هەشتەم:
## شوێنی یاریی پادشایانە

لە نزیک ڕێگای چوونە ژوورەوەی باخ، گوڵەباخێکی لێ بوو بە گوڵی سپییەوە. بەڵام سێ باخەوان تێبەری ببوون و خەریک بوون بە هەڵەداوان گوڵەکانیان سوور دەکرد. ئالیس ئەم کارەیانی زۆر پێ سەیر بوو. چووە پێشەوە کە تەماشا بکا، هەرکە نزیک بۆوە بیستی باخەوانێکیان دەڵێ «ئاگات لێ بێ پێنج! ئەوندەم ڕەنگ پێدا مەپرژێنە!»

پێنج بە قەڵسییەوە وتی «خەتای من نەبوو! حەوت لە دەستم کەوت!»

حەوت سەری هەڵێنا و وتی «باشە، پێنج! هەمیشە کەسێکی دیکە تاوانبار بکەن!»

پێنج وتی «تۆ ئیتر بێدەنگ بە! هەر دوێنێکە بوو بیستم شاژن دەیکوت حەق وایە سەرت بپەڕێنن!»

ئەو باخەوانەی لە پێش‌دا قسەی کردبوو پرسیی «بۆچی؟»

حەوت وتی « دوو! بە تۆ چی؟»

پێنج وتی «چۆن بەو چی؟ دەڵێم لە بەر چی؟ ... هەر لە بەر ئەوەی لە جیاتی پیوازی خواردن، پیوازەمشکانەی بردبوو بۆ ئاشپەز.»




ئەوندەم ڕەنگ پێدا مەپرژێنە!

حەوت پەڕەمووچەکەی فڕێ دا و وتی «قسەی نابەجێ لەمە زیاتر ...» کە ئیتر چاوی بە ئالیس کەوت، ڕاوەستابوو و سەیری دەکرد. خێرا خۆی ڕێکوپێک کرد؛ دوو باخەوانەکەی دیکەش گەڕانەوە و کڕنۆشێکی باشیان برد.

ئالیس بە پارێزەوە وتی «دەکرێ بڵێن بۆچی گوڵەکان ڕەنگ دەکەن؟»

پێنج و حەوت متەقیان لە خۆیان بڕی و چاویان لە دوو بڕی.

دوو بە هێوری دەستی پێکرد «ڕاستییەکەی، چاو لێکە دادە گیان، بڕیار وا بوو ئەم دارەی ئێرە، گوڵەباخ بێ، بەڵام ئێمە نەمانزانی گوڵی سپیمان چەقاند. ئێستاکە ئەگەر شاژن پێ بزانێ، سەری هەموومان خشتخشت دەبڕێ. هەر بۆیە دادە گیان، حەول دەدەین بەر لەوەی ئەو بێت، گوڵەکان ...» ڕاست لێرەدا هەرسێک باخەوانەکە کەوتن بە عەرزدا. دەنگی پێی دەستەیەکی زۆر هات و ئالیس کە بە تاسەی دیتنی شاژن بوو، ئاوڕی داوە.

لە پێش هەموویانەوە دە سەرباز دەهاتن، گژنیژیان پێوە بوو؛ ئەمانە ڕاست وەکوو سێ باخەوانەکە، لاکێشە و تەخت بوون و دەست و لاقی قوڵەیان لە هەر چوار سووچەکەوە هاتبووە دەرێ؛ بە دوای ئەواندا دە کەس لە دەربارییەکان، کە سەرتاپێیان بە نیشانەی خشت ڕازابۆوە، وەکوو سەربازەکان دووان دووان دەڕۆیشتن؛ دوایە منداڵانی بنەماڵەی پادشایەتی: دە منداڵی چکۆلە کە دووان دووان، دەست لە نێو دەستی یەکتردا، بە خۆشحاڵی و پێکەنینەوە هەڵبەز و دابەزیان بوو و هەموشیان نیشانەی دڵیان پێوە بوو. لە دوای ئەوانەوە میوانەکان دەهاتن کە زۆریان شا و شاژن بوون، ئالیس لە نێویاندا کەروێشکی سپی ناسییەوە کە بە تووڕەیی و بە پەلە قسەی دەکرد، لە وەڵامی هەر شتێکی هەر کەسێک بیکوتایە، بزەیەکی دەهاتێ و بێ ئەوەی سەرنج بداتە ئالیس، لە پەنایەوە تێپەڕ بوو. دوایە سەربازی دڵ هات کە تاجی پادشایەتی لە سەر پاڵپشتی کەژاوەی ئەرخەوانیدا هەڵگرتبوو. لە کۆتایی ئەم ڕیزە شکۆدارەی تەشریفهێنانەشدا:

**شا و شاژنی دڵ**

ئالیس دوودڵ بوو داخوا ئەویش دەبێ وەکوو سێ باخەوانەکە دەموچاوی لە عەرز بسوێ یان نا. قانوونێکی وای بۆ ڕێوڕەسمی تەشریفهێنانی لە بیر نەمابوو. بە خۆی وت «جیا لەوە، ئەگەر خەڵک بە دەمەوە خۆ بدەن بە عەرزدا و ڕێوڕەسمەکە نەبینن، تەشریفهێنان بە کەڵکی چی دێ؟» هەربۆیە هەر لەو شوێنەی کە بوو جووڵەی نەکرد و چاوەڕێ ما.

کە ڕیزەکە گەیشتە لای ئالیس، هەموو ڕاوەستان و چاویان لەو کرد، شاژن بە مەندییەوە وتی «ئەمە کێیە؟» ڕووی دەمی لە سەربازی دڵ بوو کە لە وەڵامدا تەنیا کڕنۆشی برد و پێکەنی.

شاژن بە وەڕەزی ئاوڕی داوە و وتی «گەمژە!» دوایە ڕووی لە ئالیس کرد «ناوت چییە، چکۆل؟»

ئالیس زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامی داوە «ناوم ئالیسە خاوەنشکۆ.» بەڵام هەر خێرا بیری کردەوە «ئەمانە تەنیا دەستێک پەڕی کایە کردنن. بۆچی دەبێ لێیان بترسم!»

«ئەی ئەمانە کێن؟» شاژن ئاماژەی بە سێ باخەوانەکە کرد کە لە دەوروبەری گوڵە سوورەکە لەسەر عەرز تخێڵ ببوون. باخەوانەکان بە دەمەوە لە سەر عەرز درێژ ببوون و چونکە نەخشی پشتەوەیان ڕاست وەکوو پەڕەکانی دیکە بوو، شاژن نەیتوانی بزانێ ئەوانە باخەوانن یان سەرباز یان دەرباری یان سێ کەس لە منداڵەکانی خۆی.

ئالیس وتی «من چووزانم؟» خۆشی ئەم ورە بەرزییەی خۆی پێ سەیر بوو. «من هیچ حەقم بە سەریانەوە نییە.»

شاژن لەبەر تووڕەیی *ئەرخەوانی* هەڵگەڕا و دوای ماوەیەک وەکوو ئاژەڵێکی کێوی، مۆڕەی لە ئالیس کرد «خێرا سەری بپەڕێنن! سەری ...»

ئالیس توندوتۆڵ وتی «چا ئەو قسە قۆڕانە!» شاژن بێدەنگ بوو.

شا دەستی لە سەر باسکی شاژن دانا و بە ئارامی وتی «خۆشەویستەکەم، چاوێکت لێی بێ، منداڵە!»

شاژن بە تووڕەیی پشتی لە شا کرد و بە سەربازی دڵی وت «ئەمانە هەڵگێڕەوە!»

سەربازی دڵ فەرمانەکەی بەڕێوە برد، بەڵام زۆر بە پارێزەوە و بە نووکی لاق.

شاژن قیژاندی «هەستن!» سێ باخەوانەکە یەکجێ هەستان و دەستیان کرد بە کڕنۆش بردن بۆ شا و شاژنی دڵ و منداڵانی بنەماڵەی پادشایەتی و ئەوانی دیکە.

شاژن هاواری کرد «بیبڕنەوە! سەرم لە گێژەوە هات!» دوایە بەرەو داری گوڵەباخ وەرسووڕا و درێژەی بە قسەکانی دا «ئێوە لێرە چیتان دەکرد؟»

دوو کڕنۆشی برد و بەوپەڕی خاکەڕاییەوە وتی «عەرزم بە خزمەتی جەنابی خاوەنشکۆ، ئێمە خەریک بووین حەولمان دەدا ...»

شاژن کە خەریکی پشکنینی گوڵەکان بوو وتی «کە شاوا! سەریان بپەڕێنن!» دوایە ڕیزی میوانەکان وەڕێکەوت و سێ سەرباز مانەوە هەتا باخەوانە چارەڕەشەکان لە سێدارە بدەن. باخەوانەکان هەڵاتن بۆ لای ئالیس، بەشکوو پشتیوانییان لێ بکا.

ئالیس وتی «نابێ بتانکووژن!» هەڵیگرتن و خستیانیە نێو گوڵدانێکی گەورەوە کە هەر لەو دەوروبەرە بوو. سێ سەربازەکە یەک دوو دەقە بە دوای باخەوانەکاندا گەڕان و دوایە بەبێ دەنگ بە دوای ئەوانی دیکەدا کەوتنە ڕێ.

شاژنی دڵ هاواری کرد «لە نێو چوون؟»

سەربازەکان لە وەڵامدا هاواریان کرد «بەڵێ... چوون! خاوەنشکۆ!»

شاژنی دڵ هاواری کرد «زۆر باشە! کرۆکێت دەزانی؟»

سەربازەکان بە بێدەنگی چاویان لە ئالیس کرد، چونکە دیار بوو ڕووی قسەکە لەوە. ئالیس هاواری کرد «بەڵێ!»

شاژن گوڕاندی «دەی وەرە!» ئالیس کە بیری بەوە قاڵ بوو دوایە چی ڕوو دەدا، هاتە نێو کۆڕەکە.

دەنگێکی بەحەیا چپاندی بە گوێیدا: «چە... چەندە هەواکەی دڵبزوێنە!»

ئالیس شان بە شانی کەروێشکی سپی دەڕۆیشت کە خەریک بوو بە دزییەوە چاوی لە ئالیس دەکرد.

ئالیس وتی «زۆر ... خاتوون لە کوێیە؟»

کەروێشک بە ئارامی و بە پەلە وتی «وستا! وستا!» بە نیگەرانییەوە ئاوڕی داوە، دوایە هەستا سەر پەنجەی، دەمی بردە پەنای گوێی ئالیس و پچەپچی کرد «سێدارەی بۆ دەرچووە.»

ئالیس وتی «بۆ؟»

کەروێشک وتی «وتت چەند بەستەزمانە؟»

ئالیس وتی «نەخێر، قەتیش بەستەزمان نییە. پرسیم بۆچی؟»

کەروێشک وتی «چونکە شەقەزلەی لە شاژن داوە...» ئالیس پڕماندی. «وستا!» کەوریشک بە نیگەرانی بە گوێیدا چرپاندەوە « شاژن دەیبیستێ! چاو لێکە، خاتوون درەنگ هاتبوو، شاژنیش وتی ...»

شاژنی دڵ وەکوو برووسکە گوڕاندی «بچنە سەر جێگای خۆتان.» هەموویان بێرە و بەوێدا ڕۆیشتن و شانیان لە یەک کوتا هەتا ئاخری دوای یەک دوو دەقە هەموویان لە سەر جێگای خۆیان ڕاوەستان و کایە دەستی پێکرد. ئالیس بە عومراتی، زەویی کرۆکێتی ئەوندە سەیروسەمەرەی نەدیبوو. زەوی پڕ بوو لە چاڵی و چۆڵی و هەوراز و نشێو. تۆپەکانی یارییەکە ژیشکی زیندوو بوون و گۆپاڵەکەیان، قورینگی زیندوو، سەربازەکانیش ناچار بوون بنووشتێنەوە و دەستیان بخەنە سەر لاقیان و ئاڵقەکانی یارییەکە دروست بکەن.

لە سەرەتای کاردا گرفتی گەورەی ئالیس، ڕاگرتنی قورینگەکەی بوو. ئاخری توانی لەشی باڵندەکە بە لاقی هەڵواسراوەوە بخاتە ژێر باڵی. هەتا ئێرە کەمتاکورتێ هاسان بوو بەڵام هەرکە ملی قورینگی ڕاست دەکردەوە و دەیویست بە سەری لە ژیشکەکە بدا، قورینگ سەری وەردەسووڕاند و ئەوندە بە واقوڕماوی چاوی لە ئالیس دەبڕی کە ئالیس خۆی بۆ ڕانەدەگیرا و پێدەکەنی، دیسان هەرکە سەری قورینگی دەخستە خوارەوە و دیسانەکە خۆی بۆ لێدان ئامادە دەکرد، قەڵس دەبوو، چونکە دەیدیت ئەوە ژیشکەکە لە دۆخی تۆپ دەرچووە و خەریکە بە زگەخشکە دوور دەکەوێتەوە. لەمانەش بەدەر، کە دەیویست ژیشکەکە بۆ هەر لایەک بخا، لە سەر ڕێگاکەی یان تەپۆڵک بوو یان قووڵکە،

چونکه سەربازە نووشتاوەکانیش لە پەستا هەڵدەستان و دەڕۆیشتن و جێگایان دەگۆڕی، ئالیس زۆر زوو بەم ئاکامە گەیشت کە ئەم یارییە، یارییەکی زۆر دژوارە.

یاریزانەکان هەموویان پێکەوە و بەبێ نۆرە، کایەیان دەکرد، هەمیشە تێک‌هەڵدەچوون، لە سەر ژیشکەکان شەڕیان دەکرد و ئێستا کایەکە بە تەواوی دەستی پێنەکردبوو کە شاژن بە تووڕەیی و سوور هەڵگەڕاوییەوە لە پەستا لاقی لە زەوی دەکوتا و هەر بە دوو دەقە جارێک هاواری دەکرد «سەری ئەم پیاوە بپەڕێنن! ئەو ژنە سەر ببڕن!»

ئالیس وردەوردە خەریک بوو نیگەران دەبوو. ئەگەرچی تاکوو ئێستا شاژن بەودا هەڵنەپڕژابوو، بەڵام دەیزانی بە نۆرەش بێ، ئەویش نۆرەی دێ. بە خۆی وت «ئەوکاتە چ بەڵایەکم بە سەر دێ؟ ئەمانە سەرلەبەریان شێتی کوشتوبڕن. دەبێ شوکری خودا بکەین کە هێشتا زیندووین!»

بە دوای ڕێگای دەرباز بووندا بوو و لە خۆی دەپرسی چۆن دەتوانێ خۆی بدزێتەوە، کە دیتی شتێکی سەیر لە حەوا وەدیار کەوت. سەرەتا تەواو گێژ بوو، بەڵام یەک دوو دەقە دواتر کە چاوی لێ‌کرد، زانی ئەمە پێکەنینێکە! بە خۆی وت «پشیلەی چێشاییرییە، باشە لانی‌کەم ئێستا کەسێک هەیە دوو قسەی لەگەڵ بکەم.»

هەرکە دەمی پشیلەکە بە جوانی وەدیار کەوت و توانی قسە بکا، وتی «حاڵوباڵت چۆنە؟»




قورینگ سەری وەردەسووڕاند و ئەوندە بە واقوڕماوی چاوی لە ئالیس دەبڕی.

ئالیس ڕاوەستا هەتا چاوەکانیشی وەدیار کەوتن، دوایە تەنیا سەری جووڵاندەوە. بیری کردەوە «هەتا گوێچکەی دیار نەبن، قسە کردنم بە کەڵکی چی دێ؟ یان لانی‌کەم یەک گوێچکەیان!» دوای دەقەیەک بە تەواوی سەری وەدیار کەوت، ئالیس قورینگەکەی لە سەر عەرز دانا و خۆشحاڵ لەوەی کە ئاخری گوێیەک هەیە قسەکانی ببیستێ، دەستی کرد بە گێڕانەوە. پشیلەکە لەوە زیاتر وەدیار نەکەوت، ڕەنگە وای بیر کردبێتەوە کە هەتا ئەو ڕادەیەی کە دەبیندرێ، بەس بێ.

ئالیس دەستی کرد بە گلەیی و بناشت. «ئەمانە خۆ کایە نازانن. شەڕێکی وا ساز دەکەن کە کابرا ئاگای لە دەنگی خۆشی نابێ... هەر دەڵێی هیچ قانوون و مانوونێکیان نییە، بیشیانبێ کەس لە بەرچاوی ناگرێ... نازانی کایە کردن بە گیانلەبەری زیندووش چەندە پیاو گێژ دەکا. بۆ نموونە ئەو ئاڵقەیە کە من دەبێ تۆپەکەم لە نێویەوە تێپەڕێنم، ئەوە خەریکە لەولایە پیاسە دەکا... هەرئێستا ئەوندەی نەمابوو لە شاژنی ببەمەوە، بەڵام ژیشکەکەی ئەو، هەرکە دیتی ژیشکەکەی من خەریکە دێت، هەڵات!»

پشیلە بە ئارامی وتی « شاژنت بە دڵە؟»

ئالیس وتی «نا، چونکە لە ڕادە بەدەر ...» هەر لەو کاتەدا زانی کە شاژن ڕاست لە پشت سەریانەوە گوێی ڕاگرتووە، ڕاوێژی دەمی گۆڕی «... ڕەنگە لە منی بباتەوە، هەر بۆیە درێژەدان بە کایەکە بە زەحمەتەکەی ناژی.»

شاژن پێکەنی و ڕۆیشت.

«تۆ لەگەڵ کێ قسە دەکەی؟»

شای دڵ خەریک بوو بەرەو لای ئالیس دەهات و بە سەرنجەوە چاوی لە سەری پشیلەکە دەکرد.

ئالیس وتی «هاواڵێکمە ... پشیلەی چێشایری. دەستوور بفەرموو پێتی بناسێنم.»

شای دڵ وتی «قەڵافەتیم وەبەر دڵ نەکەوتووە، بەڵام ئەگەر پێی خۆش بێ ئیزنی دەدەمێ دەستم ماچ بکا.»

پیشلە وتی «وام پێ باشە ماچی نەکەم.»

شا وتی «دەمدرێژی مەکە! ئاواش چاوتم بۆ دەرمەپەڕێنە!» چووە پشتی ئالیسەوە.

ئالیس وتی «پشیلە حەقیەتی چاو لە شا بکا. ئەوەم لە شوێنێکدا خوێندۆتەوە، نازانم لە کوێ!»

شا لێبڕاوانە وتی «ڕەنگە وابێ، بەڵام دەبێ بڕوا!» هەرای لە شاژنی دڵ کرد کە خەریک بوو لەوێوە تێدەپەڕی. «خۆشەویستم! پێمخۆشە فەرمان بدەی ئەم پشیلەیە لێرە بڕوا!»

شاژنی دڵ کە بۆ هەر گرفتێک، گەورە بوایە یان چکۆلە، تەنیا ڕێگاچارەیەکی دەزانی، وتی «بێسێودوو سەری بپەڕێنن!» تەنانەت چاوێکیشی لێ نەکرد.

شای دڵ بە خۆشحاڵییەوە وتی « بۆخۆم دەچم میرغەزەب دێنم!» بە پەلە ڕۆیشت.

ئالیس کە لە دوورەوە هاوارەکانی شاژنی دەبیست، بیری کردەوە وا باشە بچێ و بزانێ یارییەکە چی لێ هات. هەتا ئێرە ئاگادار بوو کە شاژن حوکمی سێدارەی بۆ سێ یاریزان دەرکردبوو بەو تاوانەی کە نۆرەکەیان سووتاوە. ئالیس ئەم ڕووداوانەی پێ خۆش نەبوو، چونکە لە تێکەولێکەی کایەکەدا نەیدەزانی نۆرەیەتی یان نا. هەربۆیە چوو بە دوای ژیشکەکەیدا گەڕا.

ژیشکەکەی ئالیس لەگەڵ ژیشکێکی دیکە پێک هەڵدەپڕژان کە ئالیس ئەمەی پێ باشترین دەرفەت بوو هەتا بە یەکیان لەوی دیکە بدا. بەڵام دیتی قورینگەکەی چووە بۆ شوێنێکی دیکەی باخەکە و ئالیسیش چاوی لێ بوو کە باڵەپڕژێیەتی هەتا هەرچۆنێک بێ بچێتە سەر دارێک.




ئاواش چاوتم بۆ دەرمەپەڕێنە!

هەتا قورینگی گرت و هێنایەوە، شەڕە ژیشک تەواو ببوو و هەردووکیان ڕۆیشتبوون. «قەیناکا، زۆریش گرینگ نییە!» ئالیس لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە «چونکە ئاڵقەکانی ئەم لایەی زەوییەکەش ڕۆیشتوون.» قورینگەکەی توند لە ژێر هەنگڵی نا هەتا دیسان هەڵنەیێتەوە و چوو لەگەڵ هاواڵەکەی قسە بکاتەوە.

کاتێک گەیشت، سەری سووڕ ما. دیتی کۆمەڵێکی زۆر لە دەوری پشیلەکە کۆ بوونەتەوە. دەمەقاڵەیەک لە نێوان میرغەزەب و شای دڵ و شاژن ساز ببوو و هەرسێکیان پێکەوە قسەیان دەکرد. ئەوانی دیکەش بێدەنگ و جاڕز ڕاوەستابوون.

هەرکە ئالیس هات، هەرسێکیان بۆ چارەسەریی گرفتەکە چوونە لای ئەو، هەرکامێکیان بەڵگەی خۆی دەهێناوە، بەڵام چونکە لە یەک کاتدا هەرسێکیان قسەیان دەکرد، ئالیس زۆر بە دژواری توانی لە قسەکەیان بگا.

بەڵگەی میرغەزەب ئەمە بوو کە هەتا سەرێک نەبێ، سەر لە لەش جودا ناکرێتەوە، لە عومراتیدا کاری وای نەکردبوو و ئێستاش لەم تەمەنەدا ئامادە نییە کاری وا دەستپێبکا.

بەڵگەی شا ئەوە بوو کە هەر شتێک سەری هەبێ، دەکرێ سەری بپەڕێنی و میرغەزەب قسەی بێهۆ دەکا.

بەڵگەی شاژن ئەوە بوو کە ئەگەر هەر دەمودەست کارەکە جێبەجێ نەکرێ، هەموویان ئیعدام دەکرێن (هەر ئەو ڕستەی دوایی، ترس و دڵەڕاوکێی خستە نێو دڵی ئامادەبووان.)




ژیشکەکەی ئالیس لەگەڵ ژیشکێکی دیکە پێک هەڵدەپڕژان.

ئالیس هەر ئەوندەی ئەقڵ پێ شکا کە بڵێ «پشیلەکە هی خاتوونە، وا باشترە لە خاتوون خۆی بپرسن.»

شاژنی دڵ وتی «خاتوون لە بەندیخانەیە. بیهێنن!» میرغەزەب وەکوو فیشەک دەرپەڕی.

هەرکە میرغەزەب ڕۆیشت، سەری پشیلەکە وردە وردە ون بوو. کاتێک میرغەزەب لەگەڵ خاتوون گەڕاوە، سەری پشیلە بە تەواوی نادیار ببوو و شای دڵ و میرغەزەب بە پەشۆکاوی بێرە و بەوێدا هەڵدەهاتن و بە دوایدا دەگەڕان، ئەوانی دیکەش گەڕابوونەوە بۆ سەر یارییەکە.

## بەشی نۆهەم:
## بەسەرهاتی کیسەڵی قەڵب

«بەندی دڵەکەم، حەک چەندە بە تاسەی دیتنت بووم!» خاتوون وەک هەڤاڵێکی باش دەستی خستە ژێر باسکی ئالیس و بە دوو قۆڵی بەڕێکەوتن.

ئالیس خۆشحاڵ بوو کە دەیدی خاتوون ڕووخۆشە، بیری کردەوە ڕەنگە ڕووگرژییەکەی لە ئاشپەزخانەش‌دا لە بەر بیبار بووبێ.

«من کە بوومە خاتوون» (ڕاوێژەکەی بۆ خۆیشی زۆر پڕ لە هیوا نەبوو)، «ڕێگا نادەم لە ئاشپەزخانەکەم‌دا بیبار بە کار بێنن. سووپ بەبێ بیباریش هەر خۆشە... ئەوەش نەبێ، ڕەنگە هەر ئەم بیبارە پیاو ئاوا تووڕە و ئاڵەتی دەکا.» خۆشحاڵ لە دۆزینەوەی ئەم قانوونە نوێیە، درێژەی بە قسەکانی دا «ترشیش دەبێتە هۆی مڕومۆچی، بەیبوونیش دەبێتە هۆی تاڵی ـ نوقڵ و ئەم جۆرە شتانەش دەبنە هۆی ئەوەی منداڵەکان خوێن‌شیرین و ڕووخۆش بن. بریا گەورەکان ئەم دەنکەیان بزانیبایە و لە کاتی شیرینی‌دان بە منداڵەکان ئەوندە وازی‌وازی نەدەبوون ...»

بوونی خاتوونی بە تەواوی لە بیر نەمابوو و کاتێک لە پەنا گوێی‌دا دەنگێکی بیست، هەڵبەزیەوە «جەرگ‌ودڵەکەم، تۆ لە بیری شتێکدای. هەر ئەمە بۆتە هۆ کە لە بیرت بچێ قسە بکەی. ئێستاکە نازانم حیکمەتەکەی چییە، بەڵام زۆر زوو وەبیرم دێتەوە.»

ئالیس ورەی هێنایە بەر خۆی و وتی «ڕەنگە حیکمەتێکی تێدا نەبێ.»




«بەندی دڵەکەم، حەک چەندە بە تاسەی دیتنت بووم!»

خاتوون وتی «نەء نەء بیچکۆل. هەر شتێک و حیکمەتێک! بەڵام دەبێ بگەڕێی بیبینیەوە.» زۆرتر خۆی بە ئالیسەوە نووساند.

ئالیس زۆری پێ خۆش نەبوو کە خاتوون ئاوا بە توندی خۆی پێوە نووساندووە. یەکەم لە بەر ئەوەی خاتوون زۆر ناحەز بوو، دووهەم لە بەر ئەوەی بالاکەی بە ڕادەیەک بوو کە چەناگەی دەگەیشتە شانی ئالیس، چەناگەشی چەندە تیژ بووا هەرچۆنێک بێ، چونکە پێی خۆش نەبوو بە بێئەدەب بناسرێ، بە نابەدڵی ددانی بە جەرگەوە گرت و لەبەر ئەوەی قسەیەکی کردبێ وتی «وا دیارە ئێستاکە یارییەکە باشتر بەڕێوە دەچێ.»

خاتوون وتی «ڕاستە، حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە ... ئاخ، ئەوینی ئەوینە کە چەرخی گەردوون دەسووڕێنێ.» ئالیس لە ژێر لێوەوە وتی «بەڵام یەکێک دەیکوت دەبێ هەر کەس سەرقاڵی کاری خۆی بێ هەتا چەرخی گەردوون بگەڕێ.»

خاتوون وتی «باشە، هەردووکیان کەمتاکورتێ واتاکەیان یەکە،» چەناگە تیژەکەی زیاتر لە شانی ئالیس ڕۆکرد و درێژەی بە قسەکەی دا «حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ... تکە تکە خڕ دەبێتەوە، دەریای وشە پڕ دەبێتەوە ...»

ئالیس بیری کردەوە «ئەمە چ پێوەندییەکی بە حیکمەتی هەرشتێکەوە هەیە!»

خاتوون دوای بڕێک بێدەنگی وتی «پێموابێ لە بیری ئەوەدای کە بۆچی دەست لە کەمەرت وەرناهێنم. لە بەر ئەوەی کە شکم لە ئەخلاقی قورینگەکەتە. دەتەوێ تاقی بکەمەوە؟»

ئالیس کە ئەم تاقی کردنەوەی بە دڵ نەبوو، بە پارێزەوە وتی «ڕەنگە گاز بگرێ.»

خاتوون وتی «ڕاست وایە. قورینگ و خەرتەلە هەردووکیان توندەتەبیعەتن و حیکمەتەکەی ئەوەیە کە ... هەر شت ڕەسەنی خۆی دەگرێتەوە.»

ئالیس وتی «جیاوازییەکەیان ئەوەیە خەرتەلە باڵندە نییە.»

خاتوون وتی «وەک جاران حەق بە تۆیە. چەندە بە سانایی و ڕوونی قسەی خۆت دەردەبڕی!»

ئالیس وتی «خەرتەلە کانزایە... پێموابێ.»

خاتوون کە وا دیار بوو دەیویست هەموو قسەکانی ئالیس پەسند بکا، وتی «هەڵبەت کە وایە! هەر لەم نزیکانە کانێکی گەورەی خەرتەلەی لێیە و حیکمەتەکەی ئەوەیە ... کانییەک ئاوت لێ خواردەوە، بەردی تێمەخە!...»

ئالیس بە هەیەجانەوە وتی «ئەها! حاڵی بووم!» هۆشی لای قسەکانی دوایی خاتوون نەبوو. «خەرتەلە گیایەکە! قەڵافەتەکەی لە گیا ناچێ بەڵام گیایە!»

خاتوون وتی «قسەکەتم تەواو بە دڵە، حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە ... تاکەی خۆم وەکوو هەم نیشان نەدەم شێتانە! ... با سادەتر بیڵێم: قەت قەت وا بیر مەکەوە تو شتێکی بێجگە لەوەی کە خەڵکی دیکە بیری لێ دەکەنەوە یان دەیانکردەوە یان ڕەنگە کردبێتیانەوە کە هەی یان بووی یان ڕەنگە بووبێتی کە بێجگە لەوەی کە بووی ئەوە نی کە بێجگە لەوە بە بیری خەڵکدا دێت.»

ئالیس زۆر بە ڕێزەوە وتی «پێموایە ئەگەر ئەو فەرمایشتانەم بنووسیبایە، چاکتر لە قسەکەت حاڵی دەبوم، بەڵام لەو شتانەی فەرمووت نەگەیشتم.»

خاتوون ڕازی و خۆشحاڵ وتی «جا ئەوە چ بوو! ئەوەی وتم لە چاو ئەوەی دەمویست بیڵێم هەر هیچ نەبوو!»

ئالیس وتی «تکایە زەحمەت مەخەنە بەر خۆتان کە هەر بەم دوور و درێژییە بێت.»

خاتوون وتی «زەحمەتی چی؟ پێت چۆنە من هەتا ئێرەی قسەکانمت پێشکەش بکەم؟»

ئالیس لە دڵی خۆیدا وتی «لەو پێشکەشییە بێخەرجە! خودایە شوکرت کە لە جەژنی لەدایکبووندا لەم دیارییانە نادەن!» بەڵام نەیوێرا ئەمانە بە دەنگی بەرز بڵێ.

خاتوون جارێکی دیکە چەناگەی تیژی لە شانی ئالیس هەڵچەقاندەوە و وتی «دیسان بیر دەکەیتەوە؟»

ئالیس کە وردەوردە خەریک بوو وەڕەز دەبوو بە تووڕەییەوە وتی «بیرکردنەوە مافی خۆمە.»

خاتوون وتی «مافی تۆ بۆ بیر کردنەوە هەر بە قەد مافی بەرازە بۆ هەڵفڕین، حیکمەتەکـ ...»

ڕاست لەم کاتەدا قسەکەی بڕی. ئالیس زۆری پێ سەیر بوو چونکە دیتی خاتوون، ڕستەی دڵخوازی خۆی تەواو نەکرد و باسکیشی کە بە باسکی ئالیسەوە بوو، دەلەرزی. سەری هەڵێنا و شاژنی دڵی دیت کە دەستی لە تەنگەی کەمەری ناوە و ڕووبەڕوویان ڕاوەستاوە، نێوچاوان‌گرژ و خوێن‌تاڵ.

خاتوون بە دەنگێک کە دەتکوت لە بنی چاڵەوە دێتە دەرێ وتی «ڕۆژێکی خۆشە، خاوەن‌شکۆ!»

شاژنی دڵ لاقی لە عەرز کوتا و قیژاندی «بەوپەڕی ئینسافەوە ئاگادارت دەکەمەوە! بە پێنج دەقە کەمتر، یان خۆت دەڕۆی یان سەرت! هەڵبژێرە!»

خاتوون هەڵیبژارد و گورج ڕۆیشت.

شاژن بە ئالیسی وت «بگەڕێینەوە سەر یارییەکە!» ئالیس ئەوندە ترسابوو کە متەقی لێوە نەهات و بە ئارامی بە دوای شاژندا ڕۆیشت و گەڕاوە بۆ نێو زەویی یارییەکە.

میوانەکان نەبوونی شاژنیان بە دەرفەت زانیبوو و خەریک بوون لە بەر سێبەر دەحەسانەوە، بەڵام هەرکە قەڵافەتی شاژنی دڵ وەدیار کەوت و لێوی بزواند کە چرکەیەک ڕاوەستان، گیانیان لە نێو دەبا، هەموویان هەڵاتنەوە بۆ لای یارییەکە.

لە هەموو ماوەی یارییەکەدا شاژن بۆ ساتێکیش دەستی لە شەڕ و کێشە لەگەڵ یاریزانەکان هەڵنەگرت و لە پەستا دەیقیژاند «سەری ئەم پیاوە بپەڕێنن!» یان «سەری ئەو ژنە لێبکەنەوە!» سەربازەکان، مەحکوومەکانیان دەگرت و چونکە نەیاندەتوانی هەم ئاگایان لە مەحکوومەکان بێ و هەم لە زەویدا ببنە ئاڵقە، نیو سەعاتی پێ نەچوو کە ئاڵقە لە زەوییەکەدا نەما و هەموو یاریزانەکان بێجگە لە شا و شاژن و ئالیس، حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچووبوو.

ئەمجارە شاژنی دڵ کە بە تەواوی شەکەت ببوو، دەستی لە کایە هەڵگرت و بە ئالیسی وت «کیسەڵی قەڵبت دیتووە؟»

ئالیس وەڵامی داوە «نا، تەنانەت ناشزانم چ گیانلەبەرێکە.»

شاژن وتی «هەر ئەوەیە وا سووپی کیسەڵی قەڵبی پێ دروست دەکەن.»

ئالیس وتی «هەتا ئێستا شتی وام نە دیتووە، نە بیستووە.»

شاژن وتی «کەوایە وەدوام کەوە. بۆخۆی بەسەرهاتەکەییت بۆ دەگێڕێتەوە.»

کاتێ وەڕێکەوتن ئالیس گوێی لێ بوو کە شای دڵ بە هێواشی بە میوانەکانی وت «هەمووتان بەخشران.» بیریشی کردەوە «دەی خوایە شوکرتا!» چونکە لەم هەموو حوکمی ئیعدامەی شاژن بە تەواوی دڵمەند ببوو.

زۆر زوو گەیشتنە لای شێرداڵ کە لە بەر خۆر خەوتبوو. شاژنی دڵ وتی «هەستە تەمبەڵ! هەستە ئەم کچۆڵەیە ببە بۆ لای کیسەڵی قەڵب هەتا گوێ لە بەسەرهاتەکەی بگرێ. من دەبێ بگەڕێمەوە و بە حوکمی ئیعدامەکان ڕابگەم.» بەپەلە ڕۆیشت و ئالیسی بە تەنیا لای شێرداڵ بەجێهێشت. ئالیس قەڵافەتی ئەم بوونەوەرەی نەکەوتە بەر دڵ بەڵام بیری کردەوە مانەوە لە لای ئەو، مەترسییەکەی کەمترە لە چاو ڕۆیشتن لەگەڵ ئەو شاژنە دڵڕەقە؛ هەربۆیە لەوێ ماوە.

شێرداڵ هەستا دانیشت و چاوەکانی هەڵگلۆفی، هەتا شاژنی دڵ‌دا گوم نەبوو، چاوی لێ هەڵنەگرت، پاشان زەردەخەیەکی هاتێ و وتی «چەن جوانە!» دەتکوت هەم لەگەڵ خۆیەتی و هەم لەگەڵ ئالیس.

ئالیس وتی «چی جوانە!؟»

شێرداڵ وتی «چی؟ شاژن! خەیاڵی خاوی کردووە، ئیعدام و میعدام لە گۆڕێ‌دا نییە، وەرە لەگەڵم!»

ئالیس ئارام ئارام وەڕێکەوت و بە خۆی وت «لێرە هەموو فەرمان دەدەن. بە عومراتم هیچ کات ئەوندەم وابکە و وامەکە پێ نەکوتراوە، هیچ کات!»

هێشتا زۆر نەڕۆیشتبوون، لە دوورەوە کیسەڵی قەڵبیان دی کە خەمبار و تەنیا لە سەر تەقتەقانێک دانیشتووە. کە نزیکتر بوونەوە، ئالیس ئاخ‌هەڵکێشانەکانی کیسەڵی بیست، دەتکوت هەر ئێستا دڵی دەتۆقێ. زگی بۆی سووتا و لە شێرداڵی پرسی «چ

بەڵایەکی بە سەر هاتووە؟» شێرداڵ هەر ئەو قسانەی پێشووی دووپات کردەوە «خەیاڵی خاوی کردووە! ئەرێ، هیچی نییە! وەرێکەوە!»

چوون بۆ لای کیسەڵی قەڵب کە بە چاوی زەلامی فرمێسکاوییەوە لەوانی ڕوانی، بەڵام هیچی نەکوت.

شێرداڵ وتی «ئەم کچۆڵەیە کە زرپ و زیندوو لێرەیە، دڵی دەکورکێنێ بۆ بەسەرهاتی تۆ، ئەرێ!»

کیسەڵی قەڵب بە دەنگێکی نووساوەوە وتی «بۆی دەگێڕمەوە. هەردووکتان دانیشن و هەتا تەواوم نەکرد، مەتەقتان لێوە نەیە.»

ئالیس و شێرداڵ دانیشتن و هەتا چەند دەقە کەس هیچی نەکوت. ئالیس بە خۆی وت «ئەگەر بە تەما نییە، دەس پێبکا، خودا دەزانێ چۆن تەواوی دەکا.» بەڵام ددانی بە جەرگیدا هێنا و چاوەڕێ ما.

ئاخری کیسەڵ بە هەناسەیەکی قووڵەوە بەسەرهاتەکەی دەس پێکرد «ڕۆژێک لە ڕۆژان، من کیسەڵێکی ڕاستەقینە بووم.»

دوای ئەم ڕستەیە، وڵات کشومات بوو. تەنیا دەنگێک وەکوو نزگەرە کە جارجارە شێرداڵ لە خۆی دەردێنا و زۆرەزۆری لەپەستای کیسەڵ ئەم بێدەنگییەی دەشکاند. چەند جار ئالیس ویستی هەستێ و بڵێ «گەورەم، سپاس بۆ ئەم بەسەرهاتە سەیرەتان!» بەڵام کێچیش کەوتبووە کەوڵی کە ئاخری دەبێ بەسەرهاتێکیش لە ئارادا هەبێ. هەربۆیە ئارام دانیشت و هیچی نەکوت.

«کاتێک منداڵ بووین،» کیسەڵی قەڵب ئاخری درێژەی پێدا. ئێستاکە برێک هێدیتر ببۆوە، ئەگەرچی ئێستاش جارجارە هەنیسکی دەدا. «لە دەریا دەچووینە قوتابخانە. مامۆستاکەمان کیسەڵێکی پیر بوو کە ئێمە پێمان دەکوت ڕەققە.»

ئالیس پرسیی «بۆچی پێتان دەکوت ڕەققە؟»

کیسەڵی قەڵب تووڕە بوو «پێمان دەکوت ڕەققە، چونکە قاپۆڕەکەی پشتی لە بەرد ڕەقتر بوو! تۆش چەند گێژی!»

شێردالّ قسەکەی کیسەڵی درێژە دا «پرسیارێ بەم ساکارییە بەڕاستی جێی شەرمە!» دوایە هەردووکیان بێدەنگ بوون و چاویان بڕیە ئالیسی بەستەزمان کە پێی خۆش بوو عەرز بقەڵەشێ و ئەو قووت بدا. ئاخری شێردالّ بە کیسەڵی قەڵبی وت «فەرمایشتەکەت بەڕەڵا کە، هاوڕێ! درێژدادڕی مەکە!» کیسەڵ درێژەی بە قسەکەی دا «بەڵێ، ئێمە لە نێو دەریادا دەچووینە قوتابخانە، ئەگەرچی ڕەنگە بڕوا نەکەی ...»

ئالیس قسەکەی بڕی «کێ وتوویە بڕوا ناکەم؟»

کیسەڵی قەڵب وتی «بۆچی، وتت!»

بەر لەوەی ئالیس لە ئەلفەوە بێتە بێ، شێردالّ وتی «زمان ئامان!» کیسەڵ درێژەی پێدا «زۆر شت فێر دەبووین ـ لە ڕاستیدا هەموو ڕۆژێک دەچووین بۆ قوتابخانە ...»

ئالیس وتی «منیش چووم بۆ قوتابخانە. پێویست ناکا ئەوندە شانازی پێوە بکەی.»

باسەکە سەرنجی کیسەڵی ڕاکێشا. «پۆلی پاش بەرنامەشتان هەبوو؟»

ئالیس وتی «بەڵێ، زمانی فەڕەنسە و مووسیقا فێر دەبووین؟»

کیسەڵی قەڵب وتی «جلشتن چی؟»

ئالیس وای زانی کیسەڵ گاڵتەی پێ دەکا. «نەخێر!»

کیسەڵ دەتکوت خەیاڵی ئاسوودە بووە. «ئەهها! کەوایە قوتابخانەی ئێوە قوتابخانەیەکی زۆر باشیش نەبووە. هی ئێمە لە نێو پسوولەکەیدا دەیاننوسی: وانەکانی پاش بەرنامە: زمانی فەڕەنسە، مووسیقا و جلشتن...»

ئالیس وتی «پێموانەبێ لە ژێر دەریادا زۆریش بە کارتان هاتبێ.»

کیسەڵی قەڵب ئاخێکی هەڵکێشا. «باری ماڵیی ئێمە زۆر باش نەبوو هەتا بتوانم لە پۆلی پاش بەرنامەدا بەشدار بم. تەنیا دەرسە ئاساییەکانم دەخوێند.»

ئالیس پرسی «چی بوو؟»

کیسەڵی قەڵب وەڵامی داوە «لە پێش هەموویاندا **خووندن** و **نواسین** و دوایە چوار کرداری سەرەکی: **جەمک، تەفتیک، تەخسیر و زەرد کردنەوە!**»

ئالیس پرسیی «زەرد کردنەوە یانی چی؟ هەتا ئێستا نەمبیستووە.»

شێرداڵ هێند سەری سوورِ مابوو کە هەر دوو پەنجەکەی کردە حەوا: «هەتا ئێستا زەرد کردنەوەت نەبیستووە؟ سوور کردنەوەت بیستووە؟»

« بەڵێ، جا دیارە.» ئالیس دوودڵ بوو. «سوور کردنەوە یانی... وەکوو ... هێرەڵماسی سوور کردنەوە.»

شێرداڵ وتی «باشە، دەی ئەگەر نەزانی زەرد کردنەوە یانی چی، زۆر حەپۆلی!»

ئالیس نەیوێرا زیاتر لە باسەکە بکۆڵێتەوە و ڕووی لە کیسەڵی قەڵب کرد «شتی دیکە چی فێر دەبوون؟»

«دەی، **مێوژیش** بوو.» کیسەڵ بە پەنجەکانی، دەستی کرد بە بژاردنی دەرسەکان. **مێوژی** کۆن و سەردەم، و **جۆغربافی**. دوایە **سێوەکاری**، مامۆستای سێوەکارییەکەمان، مارماسییەکی پیر بوو کە حەوتووی جارێک دەهات، فێری **سێوەکاری** و **ڕەزم** و **نەخاشی** بە **ڕەنجی لۆن**ی دەکرین.»

ئالیس پرسیی «ئەمەیان چ جۆرە دەرسێک بووە؟»

کیسەڵ وتی « ئەگەر ڕاستت دەوێ، ناتوانم پێتی نیشان بدەم. شێرداڵیش هەر فێری نەبوو.»

شێرداڵ وتی «دەرفەتم نەبوو. لە بری ئەو، دەچوومە سەر پۆلی دەقە کۆنەکان کە مامۆستاکەی، قرژاڵێکی لێهاتوو بوو.»

کیسەڵ هەناسەیەکی هەڵکێشا «هیچکات نەچوومە سەر ئەو پۆلە. دەیانکوت **زانستی عەرز و قیافە**ی دەکوتەوە.»

شێرداڵ ئاخێکی هەڵکێشا. «ڕاست خۆی بوو.» هەردووکیان بە دوو پەنجە دەموچاویان داپۆشی.

ئالیس بۆ گۆڕینی باسەکە بە پەلە وتی «دەی باشە، ڕۆژی چەند سەعات دەرستان پێ دەوترا؟»

کیسەڵ وتی «ڕۆژی یەکەم دە سەعات، ڕۆژی دووهەم نۆ سەعات، هەر بەم پێیە حیسابی بکە.»

ئالیس هەیەجان گرتبووی «چ بەرنامەیەکی سەیر بووە!»

شێردالّ وتی «دەی بۆیە ناویان ناوە **دەرز** گرتن! هەر ڕۆژەی، سەعاتێکمان لە بەرنامەی دەرزەکە وەردەگرت.»

باسەکە بۆ ئالیس بە تەواوی تازە بوو و بەر لەوەی شتێک بڵێ، کەمێک باسەکەی هەڵسەنگاند. «کەوایە ڕۆژی یازدەهەم پشوودان بوو.»

کیسەڵ وتی «ئەی چۆن!»

ئالیس هۆگری باسەکە ببوو «ئەی ڕۆژی دوازدەهەم چیتان دەکرد؟»

شێردالّ پەڕییە نێو قسەکان و زۆر شێلگیرانە وتی «قسەی دەرز و مەخش بەسە! ئێستا باسی کایەکانی بۆ بکە!»

## بەشی دەیەم:
# هەڵپەڕکێی قرژاڵەکان

کیسەڵی قەڵب هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە پشتی دەستی چاوی هەڵگلۆفی، چاوێکی لە ئالیس کرد و ویستی قسە بکا بەڵام هەتا یەک دوو دەقە قوڵپی گریان ڕێگای نەدا. شێردالّ وتی «دەڵێی ئێسقان لە گەرووی‌دا گیری کردووە!» دەستی کرد بە ڕاوەشاندنی کیسەڵ و کێشان بە پشتی‌دا. ئاخری هەنیسکی کیسەڵ تەواو بوو و هەروا کە فرمێسک بە ڕوخساری‌دا دەهاتە خوارێ، دەستی پێ‌کردەوە: ـ

«ڕەنگە ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەریا نەژیابی...» (ئالیس وتی «قەت!») «ڕەنگە قەتیش بە قرژاڵێک نەناسێندرابی؟» (ئالیس هات بڵێ «جارێک تامەکەییم چەشتووە!» بەڵام بە پەشۆکاوی، قسەکەی گۆڕی و وتی «نا، هیچ کات!») «ـ کەوایە ناتوانی بیر لەوە بکەیتەوە هەڵپەڕکێی قرژاڵەکان چەندە جوانە!»

ئالیس وتی «هەتا ئێستا نەمدیوە. هەڵپەڕکێیەکی چۆنە؟»

شێردالّ وتی «لە پێش‌دا لە کەنار دەریا ڕیز دەبین.»

کیسەڵی قەڵب نارەزایەتی دەربڕی «دوو ڕیز! سەگماسییەکان و کیسەڵەکان لە لایەک، ئەوانی دیکەش لە لایەک. دوایە، کە بە جوانی، ئەستێرەدەریاییەکانت لە بەر لاقت ڕادا ...»

شێردالّ پەڕییە نێو قسەکەی «ئەم کارە کەمێک کات دەگرێ.»

« ... دوو هەنگاو بۆ پێشێ...»

شێرداڵ هاواری کرد «هەرکەس لەگەڵ قرژاڵی هاوسەمای خۆی!»

کیسەڵ وتی «هەڵبەت! دوو هەنگاو بۆ پێشێ، لە ڕووبەڕووی هاوسەماوە!»

شێرداڵ درێژەی پێدا «قرژاڵ دەگۆڕی و دوو هەنگاو بۆ دواوە.»

کیسەڵ وتی «دوایە فرێی دەدەیە نێو دەریاوە.»

شێرداڵ هەڵیخستەوە و گوڕاندی «قرژاڵەکە!»

«... هەرچی دوورتر، باشتر ...»

شێرداڵ نەڕاندی «بە دوایدا مەلە دەکەی.»

کیسەڵ کە لە خۆشیانا هەڵدەبەزی و دادەبەزی؛ هاواری کرد «لە نێو دەریا سەرمەقولات لێدەدەی.» شێرداڵ قیژاندی «دیسان قرژاڵ دەگۆڕی!»

«دەگەڕێیەوە بۆ کەنار و..» کیسەڵ لەپڕدا نەشە و خۆشییەکەی نەما. «هەتا ئێرە، بەشی یەکەمی سەماکە بوو.» هەردوو گیانلەبەرەکە کە تا ئێستا وەکوو شێت هەڵیاندەخستەوە، دیسان خەمگین و دڵپەشێو، دانیشتن و چاویان لە ئالیس بڕی.

ئالیس وتی «دەبێ سەمایەکی زۆر جوان بێ.»

کیسەڵ وتی «پێت خۆشە دیمەنێکی ببینی؟»

ئالیس وتی «زۆرم پێ خۆشە.»

کیسەڵ بە شێرداڵی وت «وەرە بەشی یەکەم بەڕێوە ببەین. بەبێ قرژاڵیش هەر دەکرێ. کێ گۆرانی بڵێ؟»

شێرداڵ وتی «تۆ بیڵێ. من شێعرەکەییم لە بیر نییە.»

هەردووکیان زۆر شێلگیرانە بە دەوری ئالیسدا سەمایان کرد. جاری وا بوو کە زۆر نزیک دەبوونەوە، لاقیان پێشێل دەکرد، لە تەواوی ئەو ماوەدا بە پەنجەکانی پێشەوە، زەرباهەنگیان ڕادەگرت و کیسەڵ بە ئارامی و خەفەتەوە ئەم گۆرانییەی دەوتەوە:




*هەردووکیان زۆر شێلگیرانە بە دەوری ئالیسدا سەمایان کرد.*

ماسی بە شەیتانۆکەی کوت «زووتر بڕۆ، هەنگاو بنێ
چونکە نەهەنگی دەریایی پێی لە سەر کلکم داناوە،
کیسەڵ و قرژاڵ چاوەڕێن، بەتێکڕا ڕیزیان بەستووە،
دەیانەوێ سەما بکەن، با زوو بگەین، کات نەماوە؛
زووکە تەکانێ لە خۆت دە، بۆ ناجوولێی؟ خێراکە دەی!
ئەگەر پێتخۆشە هەڵپەڕی و بچیە نێو کۆڕی سەماوە.

چەندە خۆشە ئەو کاتانەی لە ئاوی چۆم و دەریادا
لەگەڵ قرژاڵ مەلە دەکەی، خۆ بادەدەی بە هەر لادا.»
شەیتانۆکە بە لاچاوێ لە ئێمەی ڕوانی، زەردەی گرت:
«ئەو ڕێگایە گەلێ دوورە، هەنگاوم یاریدەم نادا»
وتی ئەمن سەما ناکەم، گەلێ سپاس، من نامەوێ
بێم خۆم بادەم و هەڵپەڕم لە نێو قووڵایی دەریادا

ماسیە سپی جوابی داوە «بۆ دەڵێی ئەو ڕێیە دوورە؟
نازانی لەوبەری چۆمی، کەنارە و ئاوەکەی سوێرە؟
کە لە ئینگلیس دوور کەویەوە، نزیک دەبی لە فەڕەنسا
لەخۆڕا ڕەنگت نەپەڕێ، با پێت نەڵێن زەین کوێرە!
خێراکە، وەرە خۆت بادە، تۆزێ سەماکە لەگەڵمان
هەستە لەگەڵمان هەڵپەڕە، شەیتانۆکە تاوێ لێرە»!



ماسی بە شەیتانۆکەی کوت «زووتر برۆ، هەنگاو بنێ!»

ئالیس وتی «زۆر سپاس، سەمایەکی خۆش بوو.» خۆشحاڵ بوو کە سەماکە تەواو بووە، درێژەی بە قسەکەی دا « زۆرم ئەو گۆرانییە پێ خۆش بوو کە بە سەر ماسیی سپیتدا هەڵکوت.»

کیسەڵ وتی «باسی ماسیی سپی کرا ـ حەتمەنە دیتووتە؟»

ئالیس وتی «بەڵێ» لە دەمیشی دەرپەڕی «زۆرتر لە سەر مێزی نانخواردن ...» بەلاّم بە پەشۆکاوی قسەکەی خواردەوە.

کیسەڵ وتی «ئەهها! کەوایە میوانیان بووی، یان ئەوان میوانی تۆ بوون. هەرچۆنێک بێ، ئەگەر زۆرت دیتوون، دەزانی قەڵافەتیان چۆنە.»

ئالیس بە دوودڵییەوە وتی «پێموایە دەزانم. کلکیان لە نێو دەمیاندایە و تەواوی لەشیان بە ورکەنان داپۆشراوە.»

کیسەڵ وتی «بۆ ورکەنان لە هەڵەدای. ئاوی دەریا هەموو ورکەنانێک دەشواتەوە، بەلاّم بۆ شتی دووهەم حەق بە تۆیە، ئەوەی کە بۆچی کلکیان لە دەمیاندایە ...» باوێشکی دا و چاوی قووچاند و بە شێردالّی وت «هۆیەکەی و شتەکانی دیکە تۆ بیڵێ.»

شێردالّ وتی «هۆیەکەی زۆر هاسانە. ماسییە سپییەکان چوون لەگەڵ قرژاڵەکان هەڵپەڕن، دوایە فڕێدرانە نێو دەریا، دوایە زۆر زۆر دوور فڕێدران، دوایە کلکیان چووە نێو دەمیانەوە، ئیدی نەیانتوانی دەریبێننەوە، هەرئەوندە!»

ئالیس وتی «سپاس. سەرنجڕاکێش بوو. تاکوو ئێستا ئەوندەم شت سەبارەت بە ماسیی سپی نەزانیبوو.»

شێردالّ وتی «ئەگەر پێت خۆش بێ لەوەش زۆرترم لە لایە. دەزانی بۆ پێی دەڵێن سپی.»

ئالیس وتی «بیرم لێ نەکردبۆوە. بۆچی؟»

شێردالّ زۆرجیددی وتی «لەبەر ئەوەی کەوش و چەکمە بۆیاخ دەکا.»

ئالیس لە بەر سەرسووڕمان گەزێک دەمی کردبۆوە، زۆر گێژانە دووپاتی کردەوە «کەوش و چەکمە بۆیاخ دەکا.»

شێرداڵ وتی «بۆ نا؟ تۆ بە چی کەوشەکانت بۆیە دەکەی؟ مەبەستم ئەوەیە کە چۆن بریقەیان لێ دێنی؟»

ئالیس سەری دانەواند، چاوی لە کەوشەکانی کرد و بەر لەوەی وەڵام بداتەوە کەمێک بیری کردەوە. دوایە وتی «پێموایە بە بۆیاخی ڕەش.»

شێرداڵ بە دەنگێکی گڕەوە وتی «دەی باشە، لە ژێر دەریا بۆیاخی سپی لە کەوش و چەکمە دەدەن. ئەمجار حاڵی بووی؟»

ئالیس ئەوندەی دیکە چاوی زیت بۆوە «لە ژێر دەریا کەوش لە چی دروست دەکەن؟»

شێرداڵ بە وەڕەزی وەڵامی داوە «لەو پرسیارە! دەی، لە ماسییەپانکە! لە هەر مەیگوویەک بپرسی، ئەوە دەزانێ!»

ئالیس کە هۆشی بە لای گۆرانییەکەی کیسەڵەوە بوو وتی «ئەگەر من لە جێی ماسیی سپی بوایەم، بە نەهەنگم دەوت تکایە بە دوامدا مەیە، سەرباری!»

کیسەڵ وتی «هیچ ماسییەکی ژیر، بەبێ نەهەنگ ناچێ بۆ ئەملاولا.»

ئالیس بە سەرسوڕمانەوە وتی «بەڕاست؟»

کیسەڵ وتی «ئەی چۆن! وای دانێ دەچێ بۆ جێگایەک و دەیهەوێ سەما بکا، ئەی ناپرسن لەگەڵ کامە نەهەنگ سەما دەکەی؟»

ئالیس وتی «مەبەستت **ئاهەنگ** نییە؟»

کیسەڵ کە دەتکوت زیز بووە، وتی «مەبەستم هەر ئەوە بوو کە وتم!» شێرداڵ بە ئالیسی وت «دەی، تۆ باسی بەسەرهاتەکانی خۆت بکە!»

«دەتوانم لەم بەیانییەمەوە بیگێڕمەوە،» کەمێک شەرمی کرد «بەڵام گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی دوێنێ، هیچ کەڵکێکی نییە، چونکە دوێنێ من کەسێکی دیکە بووم.»

کیسەڵ وتی «هەموو ئەمانەی وتت، بۆمانی ڕوون بکەوە.»

شێرداڵ بەبێ ئۆقرەیی وتی «نا، نا! لە پێشدا بەسەرهاتەکان! ڕوونکردنەوە کاتی زۆری دەوێ.»

ئالیس دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی، لەو کاتەوەی کەروێشکی سپی دیبوو. سەرەتا بڕێک نیگەران بوو، چونکە هەردووک گیانلەبەرەکە بە چاوی دەرپەڕیو و دەمی ئاوەڵاوە، لە دوو لاوە خۆیان بە ئالیسەوە نووساندبوو، بەڵام وردەوردە ورەی هاتەوە بەر. دوو بیسەرەکە تەواو بێدەنگ بوون هەتا ئالیس گەیشت بە بەشێک کە ئالیس شێعری باباویلیامی بۆ کرمی هەورێشم دەخوێندەوە و وشەکان بە شێوەیەکی دیکە لە دەمی دەهاتنە دەرێ، هەر لێرەدا بوو کە کیسەڵی قەڵب هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی «زۆر سەیرە!»

شێردالّ وتی «شتی وام بە عومراتم نەبیستووە.»

«وشەکان بە شێوەیەکی دیکە دەهاتنە دەرێ.» کیسەڵ بە تەواوی چووبووە مالّی بیرەوە. «پێم خۆشە شێعرێکی دیکەمان بۆ بخوێنێتەوە. بڵێ بیخوێنێتەوە!» چاوی لە شێردالّ کرد، هەروەک بڵێی ئالیس بە قسەی شێردالّ دەکا.

شێردالّ وتی «هەستە ڕاوەستە و شێعری پرسی لە مراوی بخوێنەوە!»

ئالیس لە دڵی خۆیدا وتی «لەم بوونەوەرانە! لەپەستا فەرمان دەدەن و پیاو ناچار دەکەن وەڵامی دەرسەکە بداتەوە! هەردەڵێی هاتووم بۆ قوتابخانە!» کەچی لە جێی خۆی هەستا و دەستی کرد بە خوێندنەوەی شێعر، بەڵام ئەوندە زەینی بە سەمای قرژاڵەکانەوە قالّ بوو کە هۆشی نەبوو چی دەڵێ و شێعرەکە زۆر سەیروسەمەرە دەرچوو:



ئالیس دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانی.

**پرسی لە مراوی، ماسییەک لابرژاو**
**کوا تازە بڵێی بە جۆگەدا بێتەوە ئاو؟**
بڕوانە لە حاڵی مەیگوو چۆن لێی قەوما
هێند ماوە لەسەر ئاور هەتا هەڵقرچا
هەر ڕۆیی بە لەنجە وەک مراوی، جووکەی
تا گەییە کەنار، بە لووتی وەک بالووکەی
دایخست بەر و قۆپچە، گورج‌وگوڵ و ئازا
ڕێی گرتە بەر و لێکی بڵاو کردن پا
ڕۆیشت و گەیشتە ئاوی مەند، ڕۆخی چۆڵ
لرفەی بوو لەوێ قرشی گەروو چەشنی دۆڵ
دەریا کە شەپۆلی دا، لە دوور قرشی دی
دەنگێ بوو لە گۆڕ هاتە دەرێ، نەک چیدی!

شێرداڵ وتی «ئەمە جیاوازە لەگەڵ ئەو شتەی بە منداڵی دەمخوێندەوە.»
کیسەڵ وتی «منیش پێش‌تر نەمبیستووە. هەروەک هاتەرانپاتەران وایە.»
ئالیس هیچی نەوت. بە دەستی، دەم‌وچاوی داپۆشیبوو، لە سەر عەرز دانیشتبوو و بیری دەکردەوە کە داخوا ئەم بارودۆخە دەگەڕێتەوە شێوازی ئاسایی خۆی؟
کیسەڵی قەڵب وتی «پێم خۆشە بۆمان ڕوون بکاتەوە.»
شێرداڵ بە پەلە وتی «بۆی ڕوون ناکرێتەوە! با بچینە سەر شێعرەکەی دیکە!»
کیسەڵ پێی‌داگرت «بەڵام ئەی **پایەکان** چییان لێ دێ؟ **لێکی بڵاو کردن پا** یانی چی؟»
ئالیس وتی «ئەمە یەکەمین حاڵەتە لە سەمای بالەدا.» سەرجەمی بەسەرهاتە بە تەواوی گێژی کردبوو و خوداخودای بوو باسەکە بگۆڕدرێت.

شێرداڵ دووپاتەی کردەوە «بچینە سەر شێعرەکەی دیکە. ئاوا دەستپێدەکا «شەوێک وا هەڵکەوت ڕێم کەوتە باخی»

ئالیس ئەگەرچی دڵنیا بوو کە ئەم شێعرەش بە دروستی ناخوێنێتەوە، بەڵام نەیوێرا نارەزایەتی دەربڕێ و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دەستی پێکرد:

شەوێک وا هەڵکەوت ڕێم کەوتە باخی
کوندەبوویەکم دی لەگەڵ پڵینگی یاخی
کاتێ ڕوانیم چی ببینم، کولێرە چەورە
دیتم پڵینگ بەشی دەکرد وەک براگەورە
بۆخۆی خواردی نێوەڕاست و قەراغی برژاو
بۆ کوند ماوە دوو پەنچکی فەتیر و سووتاو
پڵینگ خواردی کولێرەکە و کاتێ بوو خۆشحاڵ
جا ڕێگەی دا بە کوندەکە هەڵگرێ چەتاڵ
پڵینگیش خێرا هەڵیگرت کەوچک و چەقۆ
بە کوندی وت هیچ نەماوە، دەبێ بخۆم ...

کیسەڵ شێعر خوێندنەوەی ئالیسی بڕی و وتی «ئەگەر لە کاتی خوێندنەوە، بۆمانی شی نەکەیتەوە، بە کەڵکی چی دێ؟ من هەر تەقە لە سەرمەوە دێ!»

شێرداڵ وتی «ئەرێ، پێموایە وا باشترە نەیخوێنییەوە.» ئالیس لە خودای دەویست وا بڵێن.

شێرداڵ وتی «پێت خۆشە بەشی دوایی سەمای قرژاڵەکان بکەین یان پێت خۆشە کیسەڵ گۆرانی بڵێ؟»

ئالیس بە شادییەوە وتی «گۆرانی! تکایە، کیسەڵ بەختەوەرمان بکە!»

ئەوندە بە تاسەوە بوو کە شێرداڵ بە دڵمەندییەوە وتی «چەندە بێمشووری! هاوڕێ، تێیهەڵکە لە سووپی کیسەڵ!»

کیسەڵ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێک کە جارجارە لەبەر هەنیسک، گڕ دەبوو، دەستی کرد بە وتنی ئەم گۆرانییە:

سووپی بەتام، کە تۆ پڕاوپڕی لە چەوری
چاوەڕوانم هەرچی زووتر بێیە نێو دەوری!
دڵی هەموو کەسی بردووە هێندە بەتامە
سووپی بەتام، سووپی ئازیز، بابەتی شامە
کێ بێ لە ژیندا، سووپی بەتام! بیر لە ما -
سی بکاتەوە، یان بیر لە نێچیر و سەما؟
خەڵکی، هەموو دنیای پێ حەرامە
لەبەر کەوچکێ لەم سووپە بەتامە!
سوووووپی ژیکەڵە!
سووووپی ژیکەڵە!
سووووپی شااامە!
سووپی چەوری کیسەڵە!

شێرداڵ قیژاندی «دووپاتەی سەربەند!» هەتا کیسەڵ سەربەندەکە بڵێتەوە، لە دوورەوە قیژەیەک هات «دادگایی دەستپێدەکا!»

شێرداڵ قیژاندی «وەرێبکەوە.» دەستی ئالیسی گرت و هەڵات و چاوەڕێی کۆتایی گۆرانییەکە نەما.

ئالیس کە بە هەناسەبڕکێ هەڵدەهات پرسی «دادگایی چی؟» بەڵام شێرداڵ لە وەڵامدا تەنیا وتی « وەرێبکەوە!» هەنگاوەکانی خێراتر کرد و هەر لەو کاتەشدا بە سواری باڵی سروە کە لەگەڵیان بوو، هەر ساتە ئەم شێعرە خەمناکەیان لاوازتر دەبیست:

سووووپی شاااام!
سووپی سووپی بەتاااام!




شێرداڵ قیژاندی «وەرێ بکەوە.»

# بەشی یازدەهەم:
# کێ شیرینییەکانی دزیوە؟

کاتێک ئالیس و شێردالّ گەیشتن، شا و شاژنی دلّ لە سەر تەخت دانیشتبوون و کۆمەلّێکی زۆریش بە دەوریانەوە بوون ـ هەموو چەشنە بالّندە و گیانلەبەری ورد، وێڕای هەموو پەڕەکان. سەربازی دلّ لە کۆت و زنجیردا بەرامبەر بە شا و شاژنی دلّ ڕاوێستابوو و لە هەموو لایەکیەوە پاسەوانێک نیگابانی دەدا. کەروێشکی سپی لە پالّ شاوە ڕاوەستابوو. دەستێکی بە کەڕەناوە گیرابوو و دەستەکەی دیکەشی بە تۆمارە پێستێکی لوولکراو. لە نێوەڕاستی دادگادا مێزێک داندرابوو کە دەورییەکی گەورەی لە سەر بوو، پڕ لە شیرینی. شیرینییەکان هێندە لە خۆش دەچوون کە تەنانەت بە دیتنەکەی ئاو زایە نێو دەمی ئالیس. «خۆزگە زووتر دادگاییەکەیان تەواو بکەن و دەورییەکە بگێڕن!» بەلّام وا دیار بوو دادگایی وا زوو دەستپێناکا، بۆیە ئالیس بە ناچاری چاوی بە دەوروبەردا گێڕا هەتا کات تێپەڕ بێ.

ئالیس هیچ کات دادگای نەدیبوو بەلّام لە کتێبەکاندا سەبارەت بەو شوێنە شتی خوێندبۆوە و خۆشحالّ بوو کە دیتی ناوی زۆربەی شتەکان و کەسەکان دەزانێ. «ئەمە قازییە، بە کلّاوقژە گەورەکەیدا زانیم!»

قازیی دادگا، شای دلّ بوو و چونکە تاجەکەی لە سەر کلّاوقژەکە دانابوو. وا دیار بوو زۆری پێوە ڕاحەت نییە، ئیدی ئەوەش هیچ کە هەر لێی نەدەهات.



کاتێک ئالیس و شێرداڵ گەیشتن، شا و شاژنی دڵ لە سەر تەخت دانیشتبوون.

ئالیس بیری کردەوە «ئەوێش شوێنی دەستەی سوێندخۆرانە، ئەو دوازدە بوونەوەرەش (ناچار بوو وشەی بوونەوەر بە کار بێنێ، چونکە هێندێکیان ئاژەڵ بوون، هێندێکیان باڵندە) پێموایە ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران بن.» دوو سێ جار بە لووتبەرزییەوە دەستەواژەی ئەندامانی دەستەی سوێندخۆرانی دووپات کردەوە، چونکە پێی وا بوو ـ حەقیشی بوو ـ زۆر کەم وا هەیە کچێک لە تەمەنی ئەودا ببێ، تەنانەت ماناکەشی بزانێ. هەرچۆنێک بێ ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران هەر ئەو مانایەی هەبوو.

هەر دوازدە ئەندامی دەستەی سوێندخۆران زوو زوو شتیان لە سەر تەتەڵەکانی بەردەستیان دەنووسی. ئالیس چپاندی بە گوێی شێرداڵدا «ئەوانە چی دەکەن؟ خۆ ئێستا دادگایی دەستی پێنەکردووە ئەمانە شت دەنووسن.»

شێرداڵ بە چپەوە وڵامی داوە «ناوی خۆیان دەنووسن، دەترسن بەر لە تەواو بوونی دادگایی، ناوی خۆیان لە بیر بچێتەوە.»

ئالیس بە تووڕەیی و بە دەنگی بەرزەوە وتی «گەمژانە!» بەڵام خێرا بێدەنگ بوو چونکە کەروێشکی سپی گوڕاندی «هێمنیی دادگا تێک مەدەن!» شای دڵ چاویلکەکەی کردە چاوی و لە دەوروبەری ڕوانی بزانێ کێیە قسە دەکا.

ئالیس وەک بڵێی لە ژوور سەری ئەندامانی دەستەی سوێندخۆرانەوە بڕوانێ، دیتی هەموویان لە سەر تەتەڵەکان نووسیویانە گەمژانە! تەنانەت دیتی یەکیان نووسینی وشەی گەمژەش نازانێ و لە هاواڵەکەی پەنای دەپرسێ. بە خۆی وت «هەتا دادگاییەکە تەواو بێ، ئەم تەتەڵانە چییان لێ دێ!»

قەڵەمی ئەندامێکی دەستەی سوێندخۆران لە کاتی نووسیندا جیرەی لێوە دەهات، ئالیسیش کە ددانی بەم دەنگە ئاڵ دەبۆوە، دەورێکی بە دادگادا لێدا و خۆی گەیاندە پشتی جاگە و لە دەرفەتێکی باشدا پڕی کرد بە قەڵەمەکەدا؛ هێندە گورج‌وگۆڵانە بوو کە ئەندامی بەستەزمانی دەستەی سوێندخۆران (کە بیلی مارمێلک بوو) هەر نەیزانی

قەڵەمەکەی چی لێ هات و بۆ دیتنەوەی چاوێکی بە دەوروبەردا گێڕا، بەڵام کاتێک نەیدیتەوە، ناچار بوو لەوە بەدوا بە قامکی بنووسێ کە هەڵبەت هیچ کەڵکی نەبوو چونکە هیچ شتێکی لە سەر تەتەڵەکە نەدەنووسی.

شا وتی «نووسیاری دادگا! بوختانەکە بخوێنێتەوە.»

بەم قسەیە کەروێشکی سپی سێ جار لە کەڕەناکەی توورپاند، دوایە تۆمارە پێستەکەی کردەوە و خوێندیەوە:

رۆژێکی جوان، لە وەرزی هاوین
شاژنی دڵ چوو شیرینی ساز کرد
سەربازی دڵ هات و دەنکی نەهێشت
گەسکی لێدا و خێرا هەمووی برد!

شا بە دەستەی سوێندخۆرانی وت «بیروڕاتان بڵێن!»

کەروێشک بە پەشۆکاوی وتی «نا، نا! هێشتا زۆرمان کار ماوە!»

شای دڵ وتی «کەوایە یەکەمین شاهید بانگ کەن!» کەروێشک سێ جار فووی بە کەڕەنادا کرد و هەرای کرد: «یەکەمین شاهید!»

یەکەمین شاهید کڵاودروو بوو، بە پەرداخێک چایی لە دەستێکیدا و لەتێک نان و کەرەش لە دەستەکەی دیکەیدا، هاتە ژوورێ و وتی «خاوەنشکۆ، داوای لێبووردن دەکەم کە بەمانەوە هاتمە ژوورێ، بەڵام کاتێک بانگ کرام، هێشتا عەسرۆژەم تەواو نەکردبوو.»

شا وتی «دەبوو تەواوت بکردایە! کەی دەستت پێ‌کرد؟»

کڵاودروو چاوی لە کەروێشکی خاکەلێوەیی کرد کە دوا بە دوای ئەو هاتە ژوورێ و قۆڵی لە قۆڵی جرجەمشکی زستانەخەودا بوو. «پێم‌وایە چاردەی خاکەلێوە بوو.»

کەروێشکی خاکەلێوەیی وتی «پازدە.»

جرجەمشک وتی «شازدە.»

شا ڕووی لە دەستەی سوێندخۆران کرد. «ئەمانە بنووسن!» ئەندامانی لیژنە بە حەز و تاسەوە هەر سێ ڕێکەوتەکەیان لە سەر تەتەڵەکان نووسی، پێکەوە کۆیان کردەوە و وەڵامەکەیان بە سێ ژمارە ڕاست و سێ ژمارەی دەیی[1]، دیاری کرد.

شا بە کڵاودرووی وت «کڵاوەکەت لابە!»

کڵاودروو وتی «ئەم کڵاوە هی من نییە.»

شا ڕوو لە دەستەی سوێندخۆران نەڕاندی «دزیویەتی!» ئەندامەکان، خێرا بابەتەکەیان نووسی.

کڵاودروو بۆ ڕوون کردنەوە وتی «من کڵاودرووم. ئەو کڵاوانەی لە سەرمی دەنێم، دەیانفرۆشم، بۆخۆم کڵاوم نییە!»

شاژن چاویلکەکەی لە چاو کرد و وا بە سەرنجەوە لە کڵاودروو خورد بووەوە کە کڵاودروو ڕەنگ بە ڕوویەوە نەما و هەڵلەرزی.

شا وتی «شایەدی بدە! مەشلەرزێ! دەنا فەرمان دەدەم هەرئێستاکە ئیعدامت بکەن!»

ئەم قسەیە حاڵی شاهیدی نەک باشتر نەکرد، بەڵکوو خراپتریشی کرد. لە پەستا ئەمپا و ئەوپای دەکرد، بە نیگەرانییەوە چاوی لە شاژن دەکرد و لەم گێروکێشەدا لە جیاتی نان و کەرە، گازێکی گەورەی لە پەرداخەکە گرت.

ڕاست لەو کاتەدا ئالیس هەستێکی سەیری تووش بوو کە هەتا بزانێ باسەکە چییە، بە تەواوی گێژ و کاسی کردبوو. خەریک بوو دیسان گەورە دەبۆوە. سەرەتا بیری کردەوە هەستێ و لە دادگا بچێتە دەرێ، بەڵام دوایە بڕیاری دا هەتا ئەو کاتەی جێی دەبێتەوە، بمێنێتەوە.

جرجەمشکی زستانەخەو کە لە پاڵ ئالیس دانیشتبوو وتی «ئەوندەم پاڵ پێوە مەنێ! هەناسەت بڕیم!»

---

[1] اعداد صحیح و اعداد اعشاری

ئالیس بە داماوییەوە وتی «بە دەس خۆم نییە. خەریکە گەورە دەبم.»

جرجەمشک وتی «ناتوانی گەورە بی، ئەویش لێرە!»

ئالیس ئەمجارەیان بە بوێرییەکی زیاترەوە وتی «قسەی قۆڕ مەکە! خۆشت گەورە دەبی!»

جرجەمشک وتی «بەڵێ، بەڵام ئەمن بە خێراییەکی گونجاوەوە گەورە دەبم، نەک بەم شێوە قۆڕە!» بە تووڕەییەوە هەستا چوو بۆ لایەکەی دیکەی دادگا.

لە هەمـوو ئەم مـاوەیەدا، شـاژن هەر چـاوی لە کـڵاودروو بـوو و هەر لەو کـاتەدا کە مشک خەریک بوو لەم سەری دادگاوە دەچوو بۆ ئەو سەر، بە بەرپرسێکی وت «لیستەی ئەو گۆرانیبێژانە بێنن کە لە دوایـین میـوانیدا بەشـدار بـوون!» کـڵاودروو بەم قسـەیە وا وەلەرزە کەوت کە هەردوو کەوشەکەی لە لاقی دەرپەڕین.

شا بە تووڕەییەوە دووپاتەی کردەوە «یان شـایەدی بـدە یـان فەرمـان دەدەم ئیعـدامت بکەن! هەڵلەرزی یان هەڵبەزی!»

کڵاودروو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دەستی پێکرد «خاوەنشکۆ! من پیاوێکی بێنەوام ــ هێشـتا عەسـرۆژەکەم تەواو نەکـردووە ـ یەک دوو حەوتـوو لەمەوبەر ـ نـان و کەرە و چاییەکی ناقابیل و ـ چایی و دوایە چاو داگرتن ـ چاو داگرتن و چایی!»

شا وتی «چاو داگرتن و چی؟»

کڵاودروو وتی «چی؟ هیچ! هەرچی! هەرچی بە چ چ چ دەستی پێکرد.»

شا بە تووڕەیی وتی «دیارە چای و چاو داگـرتن هەردووکیـان بە "چ" دەسـتپـێدەکەن! پێتوایە من نەفامم!»

کڵاودروو وتی «من کابرایەکی بێنەنوام قوربـان. ... تەنیـا دوایە لە چاوترووکانێـکدا هەموو شتێک تێکچوو. ... تەنیا ئەوە کە کەروێشکی خاکەلێوەیی وتی...»

کەروێشکی خاکەلێوەیی بە پەلە پەڕییە نێو قسەکانی «من نەموت!»

کڵاودروو وتی «وتتا!»

کەروێشکی خاکەلێوەیی وتی «ڕەتی دەکەمەوە!»

شا وتی «ڕەتی دەکاتەوا ئەم بەشە بسڕدرێتەوە!»

کڵاودروو درێژەی بە قسە دا «هەرچۆنێک بێ؛ جرجەمشکی زستانەخەو وتی...» بە پەرۆشەوە چاوی لە دەوروبەر کرد بزانێ ئەویش ڕەتی دەکاتەوە یان نا. بەڵام جرجەمشکی زستانەخەو هیچ شتێکی ڕەت نەکردەوە، چونکە لە خەودا بوو. کڵاودروو درێژەی بە قسە دا «دوایە، من لەتێکی دیکەم نان و کەرە هەڵگرت و...»

ئەندامێکی دەستەی سوێندخۆران پرسی «ئەی جرجەمشک چی وت؟»

کڵاودروو وتی «لە بیرم نییە.»

شا وتی «وە بیرتی بێنەوە! دەنا فەرمان دەدەم ئیعدامت بکەن!»

کڵاودرووی بێئەنوا پەرداخ و نان و کەرەکەی لە دەست بەربۆوە و چۆکی دادا «خاوەنشکۆ، من پیاوێکی بێچارەم!»

شا وتی «تۆ پیاوێکی بێشعووری!»

هەر لەو کاتەدا کوودەڵەیەکی هێندی هاواری کرد، بەڵام ئەم خۆنیشاندانە لە لایەن پۆلیسەکانەوە سەرکوت کرا. (چونکە سەرکوت کردن وشەیەکی کەمێک دژوارە، چۆنیەتی کارەکە شی دەکەمەوە. کیسەیەکی جاوی گەورەیان هێنا کە سەرێکی بە گوریس دەبەسترا. کوودەڵەی هێندییان بە سەرەوە خستە نێو کیسەکە و لە سەری دانیشتن.)

ئالیس بیری کردەوە «چ باش بوو دیتم ئەم کارە چۆن دەکەن. زۆر جار لە ڕۆژنامەکاندا خوێندبوومەوە کە لە کۆتایی دادگاییدا، پۆلیسەکانی دادگا خۆنیشاندانی بینەرانیان سەرکوت کردووە، بەڵام هەتا ئێستا نەمدەزانی ماناکەی چییە.»




کڵاودروو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: «خاوەنشکۆ، من پیاوێکی بێچارەم!»

شا وتی «ئەگەر لەوە زیاتر نازانی، دەتوانی لە شوێنی شاهیدەکان بێیە خوارێ»

کلاودروو وتی «ناتوانم لەوە خوارتر بێم. هەرئاواش لە سەر عەرزەکەم.»

شا وەلامی داوە «کەوایە ڕێگات پێ دەدەم لە سەر عەرز دانیشی.»

هەر لەو کاتەدا کوودەڵەی دووهەم دەستی کرد بە خۆنیشاندان کە ئەویش سەرکوت کرا.

ئالیس بیری کردەوە «دەی، ئەوە لە کوودەڵەکان. ئێستا دەتوانین بە کاری خۆمان ڕابگەین.»

کلاودروو بە پەرۆشەوە چاوێکی لە شاژنی دڵ کرد کە خەریک بوو گۆرانیبێژەکانی دەخوێندەوە. «وام پێ باشترە بچم و عەسرۆژەکەم تەواو بکەم.»

شا وتی «دەتوانی بڕۆی.» کلاودروو بە پەلە دادگای بەجێهێشت. تەنانەت ڕانەوەستا کەوشەکانیشی لە پێ بکا.

شاژنی دڵ بە پۆلیسێکی وت «لە دەرەوەی دادگا سەری بپەڕێنن!» بەلام هەتا پۆلیس گەیشتە بەر درگا، کلاودروو تێی تەقاندبوو و خۆی دەرباز کردبوو.

شا وتی «شاهیدی دوایی بانگ بکەن!»

شاهیدی دوایی ئاشپەزی خاتوون بوو. کە هات، بیباردانی بە دەستەوە بوو، تەنانەت بەر لەوەی بێتە نێو دادگا، ئالیس زانی کێیە، چونکە هەموو ئەوانەی لە نزیکی دانیشتبوون، یەکجێ دەستیان کرد بە پشمەهۆڕ.

شا وتی «شایەدی بدە!»

ئاشپەز وتی «نایدەم!»

شا بە نیگەرانییەوە چاوی لە کەروێشکی سپی کرد کە بە ئارامی وتی «خاوەنشکۆ ناچاری لەم شاهیدە لێپرسینەوە بکەی.»



کوودەڵەی هێندییان بە سەرەوە خستە نێو کیسەکە.

شا بە خەمۆکی وتـی «ئەگەر ناچـارم، کەواتە ناچـارم!» دوایە دەسـتی لە سـەر سـنگی هەڵپێکا و ئەوندە چاوی لە ئاشپەز کرد کە چاوەکانی لە نێو ڕوخساریدا ون بوو، دوایە بە دەنگێکی گڕەوە وتی «شیرینی بە چی دروست دەبێ؟»

ئاشپەز وتی «زۆرتر بە بیبار.»

دەنگێکی خەواڵوو لە پشت سەریەوە وتی «بە تڵتە.»

شاژن زریکاندی «ئەم مشکە لە کۆت و زنجیر بکەن! سەری ئەو مشکە بپەڕێنن! هـۆو مشکە لە دادگا دەرکەن! سەرکوتی بکەن! نقورچکی لێ بگرن! سمێڵی هەڵکەنن!»

بە هۆی دەرکردنی مشک، بۆ چەند دەقە دادگـا شـێوا و دوایە کە هەموویـان لە سـەر جێی خۆیان دانیشتنەوە، ئاشپەزە نەمابوو.

شا کە دەتکوت مێشکی ئاسوودە بووە وتی «گرینگ نییە! شاهیدی دوایی بێـنن!» لە ژێر لێویشەوە بە شاژنی وت «دڵەکەم! لێپرسینەوە لە شاهیدی دوایی لە ئەستۆی تـۆ بـێ! نێوچاوانم دایە ژان!»

ئالیس چاوی لە کەروێشکی سپی بوو کە خەریکی وەرددانەوەی لیستەی ناوەکان بوو، بە تاسەوە بوو بزانێ شاهیدی دوایی چ قەڵافەتێکی هەیە. بە خۆی وت «ـ هەتـا ئێسـتاکە بەڵگەیەکی ئەوتۆ کۆ نەبۆتەوە.»

ئالیس دەبێ چەندە سەری سـووڕ مـابێ کـاتێ کەروێشـک بە دەنگێکـی تیـژ لە بنـی قوڕگییەوە هاواری کرد «ئالیس!»

# بەشی دوازدەهەم:
# شایەدیدانی ئالیس

ئـالیس هـاواری کـرد «بەڵـێ!» وا هەڵبەزیـیەوە کە بە تەواوی لە بیـری چووبـۆوە لەم ساتەدا چەندە باڵای بەرز بووە و هێندە بە پڕتاو هەستا سەر پێ کە قەراغی کراسەکەی لە شوێنی دەستەی سوێندخۆران گیرا، ئەندامانی دەستە، هەموویـان پـرژ و بـڵاو بـوونەوە بە سـەر دانیشـتووانی خـوارووی شـوێنەکەدا و هەر لەوێ کەوتـنە لینگەفرتـێ. بەم دیـمەنە ئـالیس حەوتـووی ڕابـردووی وەبیـر هـاتەوە کە دەسـتی لە گـۆزەڵەی ماسـییە سـوورەکە کەوتبوو و ماسییەکان هەموویان هەڵگەڕابوونەوە.

بە شـڵەژاوی هـاواری کـرد «ئـۆۆۆی! زۆر زۆر ببـوورن!» چـونکە بەسـەرهاتی ماسـییە سوورەکان ئێستاش لە زەینـیدا مـابۆوە، خێـرا دەسـتی کـرد بە کـۆکردنەوەی ئەنـدامانی دەستەی سوێندخۆران؛ دەتکوت کەسێک بە گوێیدا دەچرپێنـێ کە دەبـێ هەرچـی زووتـر هەڵیانگرێ و بیانخاتەوە سەر شوێنی تایبەتی خۆیان، دەنا دەمرن.

«دادگـایی بەڕێـوە نـاچێ!» ڕاویـژی شـا زۆر جیـددی بـوو. «هەتـا هەمـوو ئەنـدامانی دەستەی سوێندخۆران دەگەڕێنیەوە سەر شـوێنی خۆیـان.» چـاوی لە ئـالیس بـڕی و زۆر بە جیددییەوە دووپاتەی کردەوە «هەموویان!»

ئـالیس چـاوی لە شـوێنی دەسـتەی سـوێندخۆران کـرد، دیتـی لە بەر پەشـۆکاوی، مـارمێلکەکەی بە سـەرەوە لە شـوێنەکە دانـاوە و ئەو چکـۆلە بەسـتەزمانە بێدەرەتـانە نەیدەتوانی بجووڵێتەوە و بە ناڕەحەتییەوە کلکی ڕادەوەشاند. هەڵیگرتەوە و ئەمجـارە بە

دروستی لە جێی خۆی داینـاوە «زۆریـش گرینـگ نەبـوو،» قسـەی لەگەڵ خـۆی دەکـرد «پێموانەبێ سەر و بنەکەی، جیاوازییەکی زۆری لە ڕەوتی دادگاییەکەدا هەبێ.»



*هەموویان پرژ و بڵاو بوونەوە بە سەر دانیشتووانی خوارووی شوێنەکەدا*

هەرکە ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران لەم زەبرە گورچووبڕەی هەڵگەڕانەوەی خۆیـان هاتنەوە سەر خۆ و قەڵەم و تەتەڵەکانیان بـۆ دیتـنەوە و دایـاننەوە دەسـتیان، دانیشـتن و دەسـتیان کـرد بە نووسـینی ڕاپـۆرتی ڕووداوەکە؛ بـێجگە لە مارمێلـک کە وا دیـار بـوو ڕووداوەکە هێندەی کاریگەری لە سەری هەبووە کە ئێسـتاکە هـیچ کـارێکی بـۆ نەدەکـرا بێجگە لەوەی دانیشێ و بە دەمی ئاوەڵاوە چاو ببڕێتە بنمیچ.

شا لە ئالیسی پرسی «تۆ چەندە لەم کێشەیە دەزانی؟»

ئالیس وتی «هیچ.»

شا وتی «هیچی هیچ!»

ئالیس وتی «هەر هیچی هیچ!»

شا ڕووی لە دەستەی سوێندخۆران کرد «ئەم بابەتە زۆر بەبایخە.» ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران تازە خەریک بوون ئەم ڕستەیەیان لە سەر تەتەڵەکانیان دەنووسی کە کەروێشکی سپی وتی «هەڵبەت مەبەستی خاوەنشکۆ بێبایخە.» ڕاوێژی کەروێشک پڕ بوو لە ڕێز، بەڵام بە ڕووگرژییەوە دەمەلاسکەی شای دەکردەوە.

شا بە شڵەژاوی وتی «هەڵبەت مەبەستم بێبایخ بوو.» لە ژێر لێوەوە چەند جاری وتەوە «بەبایخ، بێبایخ، بێبایخ، بەبایخ ـ» دەتکوت دەیهەوێ بڕیار بدا ئاهەنگی کامەیان خۆشترە.

چەند ئەندامێکی دەستەی سوێندخۆران نووسییان «بەبایخ» هێندێکیشیان نووسییان «بێبایخ.» ئالیس ئەمانەی دەدیت، چونکە هێندە نزیک بوو کە دەیتوانی تەتەڵەکانیان بخوێنێتەوە، بەڵام لە دڵی خۆیدا وتی «هیچ جیاوازییەکی نییە.»

لەم کاتەدا شا کە ماوەیەک بوو تەواو سەرقاڵی نووسینی دەفتەرچەی یاداشتەکانی بوو، هاواری کرد «بێدەنگ!» لە ڕووی دەفتەرچەکەوە خوێندیەوە «قانوونی ژمارە ۴۲. تەواوی ئەو کەسانەی باڵایان بەرزتر لە یەک کیلۆمیترە، دەبێ لە دادگا بچنە دەرەوە.»

هەموو چاویان لە ئالیس کرد.

ئالیس وتی «باڵای من کیلۆمیترێک نییە!»

شا وتی «هەیە!»

شاژن وتی «نزیکەی دوو کیلۆمیترە!»

ئالیس وتی «هەرچەندێک بێ ناڕۆم! بێجگە لەوە، خۆ قانوونی وا هەر نییە. هەرئێستاکە خۆتان سازتان کرد.»

شا وتی «ئەمە یەکەمین قانوونی بەردەستە.»

ئالیس وتی «کەوایە دەبێ ژمارەکەی یەک بێ.»

شا ڕەنگی هەڵبزرکا، بە پەلە دەفتەرچەکەی پێوەدا و بە دەنگێکی لەرزۆک و سووک بە دەستەی سوێندخۆرانی وت «بیروڕاتان دەربڕن.»

کەروێشکی سپی وتی «خاوەنشکۆ، ئیزن بفەرموا بەڵگەیەکی دیکە هەیە.» بە شڵەژاوی هەستا. «ئەم پەڕە کاغەزە هەرئێستاکە هاتووە.»

شاژن پرسیی «ناوەرۆکەکەی چییە؟»

کەروێشکی سپی وتی «ئێستا هەڵنەپچڕیوە. بەڵام لەوە دەچێ نامەیەک بێ کە زیندانییەکە بۆ ... کەسێکی نووسیوە.»

شا وتی «دەبێ هەر ئەوە بێ. مەگەر ئەوەی کە بۆ هیچ کەسی نووسیبێ کە هەڵبەت ئەوەش زۆر باو نییە.»

ئەندامێکی دەستەی سوێندخۆران پرسی «نامەکە ڕووی لە کێیە؟»

کەروێشکی سپی وتی «لە کەس! لە ڕاستیدا لە پشت بەرگەکە هیچ نەنووسراوە.» لەو کاتەدا کاغەزە نووشتاوەکەی کردەوە و درێژەی بە قسە دا «هەر نامەش نییە. پارچە شێعرێکە.»

ئەندامێکی دیکەی دەستەی سوێندخۆران پرسی «دەسخەتی زیندانییەکەیە؟»

کەروێشکی سپی وتی «نا، دەسخەتی ئەو نییە، سەیرترین شتیش هەر ئەمەیە!»

(ڕوخساری ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران تێکچوو.)

شا وتی «حەتمەن لاسایی خەتی کەسێکی دیکەی کردۆتەوە.»

(ڕوخساری ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران کراوە.»

سەربازی دڵ وتی «خاوەنشکۆ، تکاتان لێ دەکەم. من نەمنووسیوە. ناکرێ بە سەر منیدا ساغ بکەنەوە، چونکە هەر ئیمزای پێوە نییە.»

شا وتی «ئەگەر ئیمزات نەکردووە، کەوایە نیازێکی گڵاوت بووە؛ دەنا وەکوو هەموو کەسێکی ڕاست و دروست، ئیمزات دەکرد.»

هەموو چەپڵەیان بۆ شا لێدا. ئەمە یەکەمین قسەی ژیرانەی شا لەو ڕۆژەدا بوو.

شاژن وتی «هەر ئەمە تاوانەکەی دەسەلمێنێ، کەوایە سەری ...»

ئالیس وتی «نەخێر تاوانی ناسەلمێنێ! ئێوە هەر نازانن کاغەزەکە چی تێدا نووسراوە!»

شا وتی «بیخوێننەوە!»
کەروێشکی سپی چاویلکەی لێدا «خاوەنشکۆ، لە کوێوە دەستپێبکەم؟»
شا ڕووی گرژ کرد «لە سەرەتاوە دەستپێبکە، دوایە درێژەی پێ بدە تا دەگەیە کۆتایی. دوایە ئیدی مەیخوێنەوە.»
بێدەنگییەکی سەیر دادگای داگرت و کەروێشکی سپی خوێندیەوە:

وەک بیستوومە دەڵێن چووی بۆ لای ئەو ژنە
لای ئەو پیاوەش بە خراپ ناوت هێناوم
بەڵام ئەو ژنە ڕازی بوو لە من گەلێ
گەرچی وتی لە مەلەدا ناتەواوم

ئەو پیاوە هەواڵی نارد بۆم، بەڵام نەچووم
(لای ئێمە ڕوونە تەواوی ئەو شتانە!)
گەر ئەو ژنە بگرێ سۆراخی ئەو کارە
حاڵت شڕ دەبێت و دەکەویە تەنگانە!

من دەنکێکم بەخشیوە بە ئەو خاتوونە
ئەوانیش یەکێ زیاتریان دا بەو پیاوە
هەمووی دیسان هەر بۆ لای خۆی گەڕایەوە
گەرچی هەمووی هی من بوو لە سەرەتاوە

خوداوڕاستان، ئەگەر من و ئەو خاتوونەش
بە دزیەوە دەستمان لەو کارەدا بوایە
هەروەکوو چۆن لەگەڵ ئێمە بوویە هاوڕێ
کاری بە تۆش هەر نەدەبوو ئەو ئاغایە

لەمێژە بیر و خەیاڵ هەڵمی گرتووە:
(دەتدی لە خۆی بێخود دەبێ ئەو خاتوونە)
تۆ بووی بە لەمپەرێکی گەورە، لە ئێمە و
خاتوونیش و لانی کەم ئەو شتەش کە ڕوونە!

نەکا ڕۆژێ ئەو ئاغایە پێ بزانێ
حەز بە چارەی ئەوان دەکا ئەو خاتوونە،
بەڵام ئەم نهێنییە لە لای خۆت ڕاگرە
کاری ئێمە لە بەرچاویان بزر بوونە.

شا دەستی لێکدان. «ئەمە گرینگترین بەڵگەیە کە پیشان دراوە. کەوایە لێژنەی داوەران ئێستا...»

ئالیس وتی «ئەگەر هەرکام لە ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران بتوانێ شێعرەکە مانا بکاتەوە... (لەم ماوەیەی دوایی‌دا ئەوندە بالای بەرز ببوو کە لە برینی قسەی شا نەدەترسا.) «... من خەڵاتی دەکەم. پێم‌وانییە ئەم شێعرە تۆزقاڵێک مانادار بێ.»

ئەندامانی دەستەی سوێندخۆران لە سەر تەتەڵەکان نووسییان «پێی‌وانییە ئەم شێعرە تۆزقاڵێک مانادار بێ.» بەڵام کەس ئامادە نەبوو شێعرەکە مانا بکاتەوە.

شا وتی «ئەگەر مانای نییە، کەوایە زەحمەتی ئێمەش زۆر کەم دەکاتەوە، چونکە پێویست ناکا بە دوای ماناکەی‌دا بگەڕێین، بەڵام هەر لەو کاتەش‌دا...» کاغەزەکەی لە سەر ڕانی پان کردەوە، بە لاچاوێک سەیری کرد و درێژەی بە قسەکەی دا «پێم‌وایە زۆریش بێ‌مانا نییە. ـ گەرچی وتی لە مەلەدا ناتەواوم ـ تۆ مەلە نازانی، دەزانی؟» خەریک بوو لە سەربازی دڵی دەپرسی.

سەربازی دڵ بە خەفەتەوە سەری لەقاند. «قەڵافەتی مـن بـۆ ئەوە دەبـێ مەلە بـزانم؟» (هەر لێی نەدەهات، چونکە سەر تا پێی لە مقەوا بوو.)

شا وتی «زۆر باشە. هەتا ئێرە باش چووینەتە پـێش.» لە ژێـر لێـوەوە دەسـتی کـرد بە خوێنـدنەوەی چەنـد بەشـێکی شـێعرەکە « **لای ئـێمە ڕوونە تەواوی ئەو شـتانە** ... دیـارە مەبەستی دەستەی سوێندخۆرانە. "**گەر ئەو ژنە بگرێ سۆراخی ئەو کارە** ... لێرەدا دەبـێ مەبەستی شاژن بووبێ. "**حاڵت شڕ دەبێت و دەکەویە تەنگانە** ... هەر واشە! "**من دەنکێکم بەخشیوە بە ئەو خاتوونە / ئەوانیش یەکێ زیاتریان دا بەو پیاوە** ... دەی، لێرەدا حەتمەن مەبەستی ئەو بەڵایە بووە کە بە سەر شیرینییەکانی هێناوە ...»

ئالیس وتی «بەڵام دوایەکەی ئەمەیە "**هەمووی دیسان هەر بۆ لای خۆی گەڕایەوە.**»

شا وەک سەرکەوتوویەک وتی «هەڵبەت! هەمووی لێرەیە!» ئاماژەی بە شیرینییەکانی سەر مێزەکە کرد. « لەوە ڕوونتر چی هەیە! بەڵام لە درێژەی شێعرەکەدا: **دەتـدی لە خـۆی بێخود دەبێ ئەو خاتوونە!**) دڵەکەم، خۆ تۆ هیچ کات لە خۆت بێخود نابی؟» ڕووی دەمی لە شاژن بوو.

شاژن وەک شێت هاواری کرد «قەت قەت!» جەوهەرەکەی فـڕێ دا بـۆ لای مارمێلـک. (بیلی ڕێزەڵەی چارەڕەش کە بە قامک لە سەر تەتەڵەکە شـتی دەنووسـی و تـازە دەسـتی هەڵگرتبوو، چونکە دیتی هیچ نووسراوەیەک بە سەر تەتەڵەکەوە نامێنێ؛ دیسـان بە پەلە دەسـتی کـردەوە بە نووسـین، ئەویـش بە قامـک تێـوەردان لەو جەوهەرەی پڕژابـوو بە دەموچاویدا.)

شـا وتـی «کەوایە بێخـود! بێخـود نـاگەڕێتەوە سـەر تـۆ.» بە پێکەنیـنەوە چـاوی لە دەوروبەر کرد. بێدەنگییەکی سەیر باڵی بە سەر وڵاتدا کێشابوو.

شا بە تووڕەییەوە وتی «ئەمە تەنیا کایە کردن بە وشەیە!» هەموویان دایـان لە قاقـای پێکەنین.

شا بۆ بیستەمین جار وتی «دەستەی سوێندخۆران ڕاتان بڵێن!»

شاژن وتی «نا، نا! سەرەتا بەڕێوەبردنی حوکم، دوایە ڕای دادگا!»

ئـالیس بە دەنگێکـی بەرز وتـی «چـا ئەم قۆڕیاتـانەا بەڕێـوەبردنی حـوکم، بەر لە ڕای دادگا!»

شاژن لە تووڕەیی‌دا سوور هەڵگەڕا و وتی «زمانت نەگەڕێ!»

ئالیس وتی «دەگەڕێ!»

شاژن بە هەموو هێزی خۆیەوە هـاواری کـرد «سـەری بپەڕێـنن!» کەس لە جێـی خـۆی نەجووڵا.

ئالیس وتی «کێ لە تۆی پرسیوە! (ئێستاکە هاتبۆوە سەر قەوارەی سروشـتیی خـۆی.) ئێوە تەنیا دەستەیەک پەڕن، نەک شتێکی دیکە!»

هەرئەوەی وت دەسـتەی پەڕەکـان بەرز بـوونەوە و بە بـاوەخولێ کەوتـن بە سـەریدا. ئالیس هەم لە بەر ترس و هەم لە بەر تووڕەیی کەمێک قیژاندی و هەرکە ویستی لە خـۆی دووریان بخاتەوە، دیتی لە لێواری چۆمەکە ڕاکشاوە و سەری لە سەر ڕانی خوشکەکەیەتی کە بە ئارامی خەریک بـوو ئەو گەڵا ویشـکانەی بە سـەر دەموچـاوی ئـالیس‌دا وەریبـوون، لادەبرد.

خوشکەکەی وتی «ئالیس، جەرگەکەم! هەستە! هەک لەو خەوە قووڵە!»

ئالیس وتی «ئۆخەیش، چ خەونێکی سەیرم دیت!» ئەوندەی لە بیری مابوو، بۆ خوشکی گێـڕاوە؛ هەمـوو ئەو بەسـەرهاتە سـەیرانەی کە ئێـوە هەتـا ئێـرە خوێنـدتانەوە. کاتێـک قسەکانی تەواو بوو، خوشکی ماچی کرد و وتی «هەر بەڕاسـت چ خەونێکـی سـەیر بـووە! بەڵام بە قوربان، ئێستاکە دەس‌هەڵێنە! وەختی عەسرۆژەیە و خەریکە درەنگ دەبێ.»

ئالیس هەستا و هەڵات و لە کـاتی هەڵاتـن‌دا، هەتـا ئەو جێـیەی لە زەینـی‌دا مـابوو، بیری لەو خەوە سەیروسەمەرەیەی خۆی کردەوە.




دەستەی پەڕەکان بەرز بوونەوە.

بەڵام دوای ڕۆیشتنی ئالیس، خوشکی هەر لەوێ دانیشت، سەری خستبووە سەر دەستی، نوقمی تەماشای دیمەنی ڕۆژئاوا بوو؛ بیری لە ئالیسی بیچکۆلە کردەوە و بەسەرهاتە سەیرەکەی، هەتا وای لێهات کە خۆشی چووە خەونەوە و ئەمە بوو خەونەکەی:

سەرەتا خودی ئالیسی دیت. جارێکی دیکە بە دەستە چکۆلەکانی، ڕانی خوشکە گەورەکەی لە باوەش گرتووە و بە چاوی پڕ لە ترووسکە و تاسەوە لەوی دەڕوانی ـ دەنگی ئالیسی بیست و جووڵەی خێرای سەری دیت کە پەیتا پەیتا بۆ دواوە دەجووڵاوە هەتا ئەگریجەیەکی لاسار لادا کە لە پەستا دەهاتنە نێو چاوی. هەروا کە گوێی ڕاگرتبوو یان پێی وا بوو کە گوێی ڕاگرتووە، تەواوی دەوروبەری، بە بوونەوەرە سەیرەکانی خەونەکەی خوشکە چکۆلەکەیەوە، گیانی وەبەر هات:

گژوگیا بەرزەکانی ژێر لاقە بەپەلەکانی کەروێشکی سپی کەتبوونە خشەخش، مشکەکە لە گۆلاوەکەی پەنایدا بە ترسەوە هەڵبەز و دابەزی دەکرد، دەنگی لێکدرانی پەرداخەکان دەهات، لە عەسرۆژەی هەرمانی کەروێشکی خاکەلێوەیی و هاوڕێکانی و هاوارەکانی شاژنی دڵ کە میوانە چارەڕەشەکانی دەدایە دەستی میرغەزەب، جارێکی دیکە کوودەڵە بە سەر ڕانی خاتووندا پشمی و هەر لەو کاتەدا لە دەوروبەریاندا دەوری و قاپ و قاچاخەکان وردوخاش دەبوون. جارێکی دیکە هاوارەکانی شێردالّ و جیرەجیرِی قەڵەمی مارمێلک لە سەر تەتەڵەکە و دەنگی گیراوی کوودەڵە سەرکوتکراوەکان وڵاتی تەنی، زۆرەزۆری لە دوورەوەی کیسەڵی چارەڕەشیش لەولاوە.

بە چاوی قووچاوەوە دانیشت و خۆی لە نێو وڵاتی سەیروسەمەرەکاندا دی. گەرچی دەیزانی هەر ئەوەندەیە چاو بکاتەوە، هەتاکوو دنیا دیسان ببێتەوە هەر ئەو دنیا شەکەتیهێنەی ڕاستییەکان: با، خشەخشی بە گیاوگژەکان خستووە، لارولەنجەی قامیشەکان شەپۆل دەخاتە نێو گۆلاوەکە. دەنگی پەرداخەکان دەبنە زەنگی مەڕەکان و هاوارە تیژەکانی شاژنی دڵ، دەبێتە دەنگی کوڕە شوانەکە؛ پشمینی منداڵ و قیژەی شێردالّ و هەموو دەنگە سەیرەکانی دیکەش (دڵنیا بوو) دەبن بە هەراوهوریای ڕۆژانەی مەزرایەک و دەنگی مێگەلی دوورەدەست، جێی زۆرەزۆری دڵتەزێنی کیسەڵ دەگرێتەوە.

لە کۆتاییدا ڕۆژگارێکی هێنا بەرچاوی خۆی کە خوشکە چکۆلەکەی، خۆی بۆتە خاتوونێک. خاتوونێک کە لە ساڵانی ساردوگەرم چێشتوویشدا دڵی ساکار و لێوانلێوی ئەوینی منداڵیی خۆی پاراستووە و منداڵانێکی دیکە لای خۆی کۆ دەکاتەوە هەتا بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەیری لە ڕادە بەدەر، بە هیوایە خەونی وڵاتی سەیروسەمەرەکانی ساڵانی ڕابردوو، ترووسکە و تاسەیەک بخاتە نێو نیگای ئەوانیشەوە؛ ببێتە شەریکی خەمە سادەکانیان و لە شادییە بچووکەکانیان چێژ وەرگرێ، ئەویش بە یادی سەردەمی منداڵیی خۆی و ڕۆژانی خۆشی هاوینێک.



لە کۆتـــایی دەسنووســـی یەکەمـــی کتێـبەکەدا، لـوویيس کـارۆل وێنەیەکـی حەوتساڵانەی ئالیس لیدلی لێدابوو کە خۆی گرتبووی.

دواتـــر، لە ژێــر ئەو وێـــنەیەدا، وێـــنەی ئالیســـیان دیـــتەوە کە کـــارۆل خـــۆی کێشابوویەوە.



## فەرهەنگۆک

**تەخسیر:** لەش‌گرانی، تای سووک؛ کۆتایی؛ گوناح، هەڵە. (لێرەدا مەبەست "تقسیم"ە کە یەکێک لە چوار کرداری سەرەکی لە ماتماتیکدایە.)

**تەفتیک:** کوورروو، کوڵکەی نەرمی ژێرەوەی خوری و مووی بزن. (لێرەدا مەبەست "تفریق"ە کە یەکێک لە چوار کرداری سەرەکی لە ماتماتیکدایە.)

**جاگە:** شوێنی تایبەتی بۆ ڕاوەستانی شاهید لە دادگادا.

**جومگە:** شوێنی وێک‌گەوتنی دوو ئێسک، بەند (مفصل).

**جەمک:** ١ــ ئەوندە ماستەی جارێک دەکرێتە مەشکەوە ٢ــ بڕبڕە مژاندنی بێچوو لە گوانی دایک بۆ شیردادان. (لێرەدا مەبەست "جمع"ە کە یەکێک لە چوار کرداری سەرەکی لە ماتماتیکدایە.)

**چوار کرداری سەرەکی:** واتە کۆکردن (جمع)، لێ‌دەرهاویشتن (تفریق)، دابەشاندن (تقسیم) و لێکدان (ضرب).

**چەتاڵ:** چنگاڵ.

**چەکچەکیلە:** شەمشەمەکوێرە.

**حاستەم:** دژوار.

**ئەسکەمل:** کورسی لە سەر دانیشتنی یەکدەس، سەندەڵی.

**بڕست:** هێز.

**بوختان:** بوهتان (اتهام).

**بۆیاخ:** بۆیە (واکس).

**بۆیە:** بۆیاخ (واکس).

**بێلۆچکە:** پێمەڕەی چکۆلە.

**پرپیشکگر:** پرپیشکەگر، کەرستەیەک کە پرپیشکەی ئاور دەگرێتەوە و ناهێڵێ بڵاو بێتەوە.

**پشوودان:** حەسانەوەی کۆتایی حەوتوو یان ساڵ.

**پلان:** نەخشە.

**پەڕ:** وەرەقی یاری کردن.

**پەرژین:** چین، شوورەی بە دڕوو.

**پەڕەمووچ:** قەڵەم‌موو، قەڵەمی شێوەکاری.

**پەمەیی:** ڕەنگی چێرەیی، (صورتی).

**پەنچک:** پاژ، پارچە، تیکە، پاروو.

**تڵتە:** پڵتە، تلف.

**تەتڵەمیران:** کرمێکە ئەستوور کە دوو ڕیز پای هەیە.

**تەتەڵە:** پارچە تەختە یان پارچە بەردی پانکەڵە بۆ لە سەر نووسین، لەوح.

**قرش:** کووسە.
**قورینگ:** پەلەوەرێکە (فلامینگو)
**قۆپچە:** دوگمە.
**قەپۆز:** لووت، کەپۆ.
**قەڵب:** درۆزنە، ساختەچی (تقلبی)
**کوڵک:** خوری.
**کوودەڵە:** بەچکەی بەراز.
**کۆزیلکە بەستن:** کۆ بوونەوە بە دەوری یەکدا.
**کەپۆ:** لووت.
**کەڕەنا:** شەیپوور.
**لرفە:** هاژە.
**لێوانلێو:** پڕ، تەژی.
**ماتماتیک:** ڕیازی.
**مقەوا:** مقەبا، کارتۆن.
**میرغەزەب:** جەللاد.
**نوقڵ:** شوکولات.
**نووسیار:** مونشی.
**هاتەرانپاتەران:** قسەی هەڵیتوپڵیت.
**هەڵەداوان:** پەلە.
**هەنگڵ:** باڵ.
**هەویرکوت:** پماد.
**یەسقان:** ئێسک، ئێسقان.

**خورماپێچان:** مشکی خورما؛ ئاژەڵێکە (موش‌خرما)
**خەرتەلە:** تۆوێکی تیژە، لە تایفەی ئیسیوەت و ئالات
**دڵەدوایی:** دڵەڕاوکێ.
**دەمەقاڵە:** شەڕە دەندووک، دەمەقرە.
**ڕۆخ:** لێوار، کەنار.
**زەرب ڕاگرتن:** بە لێدانی قامکان لە سەر شتێک، دەنگێ ئاهەنگین بەدیهێنان.
**زەرباهەنگ:** ڕیتم، کوتەی ئاهەنگ.
**ساکار:** هاسان، سادە.
**سنار:** قەرەپووڵ، پارەیەکی کەم و بێبایخ.
**سەروسەکوت:** ڕوخسار، قەڵافەت.
**شاگەشکە:** بریتییە لە خۆشحاڵیی زۆر.
**شەک:** بەرخی دوو بەهار دیتوو.
**شەکی دابەستە:** بریتییە لە بەرخی قەڵەو.
**شەمەندەفەر:** قەتار.
**فسۆس:** جانەوەرێکی بەڵەک لە تیرەی سمۆرە، بۆگەنی پیسی لێ دێ. (ڕاسوو)
**فیشکاندن:** جۆرێک دەنگ لێهاتنی حەیوان لە کاتی دەرپەڕیندا.
**فیشەک:** گوللە.
**فەنەر:** کانزای باریکی نەرم. زەمبەلەک
**قرتاڵە:** زەمەە، سەبەتە.

